The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو کەلێکی خاوەن بڕیاردا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم - ژمارە 30 - تشرینی دووەمی 2010



حساب بانکی گۆڤار

بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371



sarnosar@yahoo.com

بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣

کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ -٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

چاپخانەی سەردەم

نرخ 2500 دینار

# با وته جوانه‌کانمان بکه‌ینه کرداری جوان!!

له مێژه‌وه گوتراوه کرده‌وه‌ی جوان له وته‌ی جوان باشتره، کاری جوانیش به‌رهه‌مـی بیرۆکه‌ی جـوانو فیکری به‌رزو ڕۆشنبیری‌و ماریفه‌تی بڵنده.

ئێمـه‌ش له بڕیـاردا وته‌گه‌لێکی جـوان ده‌نووسـین، خوێنه‌رانیـش شـتی جـوانو ڕازاوه ده‌خوێننه‌وه‌و له گوڵزاری وشه‌ی هه‌میشه به‌هاری بڕیـاردا گوڵه‌وه‌چنێـی وته‌ی به‌رزو فیکـری وردو به‌رنامـه‌ی ڕێکوپێك ده‌کـه‌نو ماوه‌یه‌کـی زۆره مانگانـه مه‌لۆی نوێ ده‌خه‌نه سه‌ر خه‌رمانی زانستو ڕۆشنبیرییان.

که‌واته کاتی ئه‌وه هاتووه ئه‌و وته به نرخانه، ئه‌و بیرۆکه به‌رزانه، ئه‌و به‌رنامه گرنگانه، بگۆڕین بۆ کردارو وتـه جوانه‌کانمان بۆ کرداری جوان ئاکتیڤ بکه‌ین!

ئیتر نابێـت چیدی ڕێگه بده‌ین ئه‌و شـته جوانانـه ته‌نهـا له دوو توێـی لاپه‌ڕه‌ی کتێـبو گۆڤاره‌کاندا به‌ند بنو له واقیعی ڕۆژانه‌ی ژیاندا بوونیان نه‌بێت.

چونکـه وه‌ختێك ڕۆشـنبیران ده‌توانـن ڕۆڵـی به‌رچـاوی خۆیان لـه ئاراسـته‌کردنی کۆمه‌ڵـگاو به‌ره‌وپێشبردنیدا ببینن که بتوانن گوفتـاره جوانه‌کانیـان بکـه‌ن به کـردارو قسـه‌و کرده‌وه‌یـان یه‌ك بێت.

بێگومانـم ئـه‌و کات کۆمه‌ڵـگا وه‌کـو ڕابه‌رێکی پیرۆز ته‌ماشـایان ده‌کاتو ئاماده‌یه گوێبیسـتی هه‌موو وته‌کانیان بێت.

به‌ڵام کاتێك ئێمه باسی (کۆماری ئه‌فلاتۆن) بۆ خه‌ڵك بکه‌ینو داوا له خه‌ڵك بکه‌ین سـوود لـه کاته‌کانیان وه‌ربگـرن، ڕێکوپێك‌و نموونه‌یی بن، بـه به‌رنامه کار بکـه‌ن، دادگه‌ر بن، ڕاستگۆ بن، په‌یوه‌ست بن به یاساوه، ڕێزی یه‌کتـری بگرن، هه‌ق بێژ بن، وڵاتپـه‌روه‌ر بن، سـه‌ربه‌خۆ بن، بۆ پێشـکه‌وتنی وڵات درێغـی نه‌کـه‌ن، پارێزگاری له سه‌روه‌تو سامانی وڵات بکه‌ن، ده‌ستی میهرو به‌زه‌یی بن، بۆ هه‌ژاران، مه‌رهه‌می برینه‌کان بن...

هه‌مـوو ئـه‌م وتـه جـوانو به‌نرخانه نرخی ئـه‌و مره‌که‌به‌یان نابێت که پێی ده‌نووسـرێت، کاتێك خۆمـان پێچه‌وانـه‌ی قسـه‌کانمان ده‌جوڵێینه‌وه!!

بـه تایبـه‌ت کاتێك سـه‌رکرده‌و ڕۆشنبیره‌کانمان پێشه‌نگی سه‌رپێچی ئه‌و بنه‌ماو به‌هاو به‌رزانه‌ن، هاوکات ئه‌گه‌ر به‌و شـێوه‌یه بـه‌رده‌وام بین هه‌رگیـز ناتوانیـن کۆمه‌لگایه‌کـی شارسـتانی‌و پابه‌ند به یاسـاو به‌ها به‌رزه‌کانه‌وه بنیات بنێین.

که‌واتـه با له خۆمانه‌وه ده‌سـت پـێ بکه‌یـن، بـا ئـه‌وه‌ی ده‌زانینو ده‌یخوێنینـه‌وه لـه خۆماندا ڕه‌نگ بداتـه‌وه، پاشـان بـه پـرۆژه‌ی به سوودی جۆراوجۆره‌وه هه‌وڵی گۆڕانی کۆمه‌لگا بده‌ینو ئه‌و وانانه بلێینه‌وه که له قوتابخانه‌ی بڕیاره‌وه فێریان بووین.

لـه هه‌مـوو هه‌نگاوێکیشـدا با (بڕیار) باشترین هاوڕێمان بێت.

# کارگێڕی بە گوفتار

گەورەترین کار کە باوک بۆ منداڵەکانی بکات، ئەوەیە کە دایکیانی خۆش بوێت!

تیۆدۆر هیرک

ئەوەی دوژمنەکانی لە خۆی نزیک بکاتەوە، بکوژی خۆیەتی.

ئیبنو حەزم

بۆچی شوێنی ڕای زۆرینە دەکەوین؟ لەبەرئەوەی لە ڕاستییەوە نزیکن! نەخێر، لەبەرئەوەی بەهێزترن!

باسکاڵ

زۆر قسەکردن لە بارەی هەنگوینەوە، شیرینی نابەخشێت بە نێو دەمی مرۆڤ!

ئەدوار غالیب

ئەوەی بزانێت چۆن ماستاو دەکات، دەشزانێت چۆن لە پاشملە باست دەکات!

ناپلیۆن

هیچ مەڵێ بێ بیرکردنەوە، هیچ کارێکیش مەکە بێ پلاندانان.

ئەبوجەعفەری مەنسور

# ئاکاری مرۆڤە گەورەکان

لەگەڵ گزنگی هەمـــوو ڕۆژێکی نوێدا، لاوێکی جـــوان دەچـــووە کۆشـــکی نزیکی ماڵەکەیـــان بـــۆ کڕینی ڕۆژنامـــە، هەموو کاتێکیش کە دەچووە لای کابرای ڕۆژنامە فرۆش بە ڕێزەوە سڵاوی لێ دەکرد.

ئـــەوەی جێگـــەی سەرســـوڕمان بـــوو ڕۆژنامـــە فرۆشـــەکە زۆر بە وشـــکیو بێ زەوقانە مامەڵەی لەگەڵ دەکردو نەك هەر بەشـــێوەیەکی جوان وەڵامـــی نەدەدایەوە، بەڵکو هەر وەڵامیشی نەدەدایەوە، بە هیچ شێوازێك.

کابرایەکـــی دراوســـێیان هـــاوڕێ بەو کوڕە لاوە کـــە بەیانیان بۆ ڕۆژنامە کڕین دەهاتـــە ئەوێو ئـــاگای لـــەو کارە هەبوو، کاری کوڕە لاوەکەی بە لاوە سەیر بوو، بە سەرســـوڕمانەوە لێی پرسی: چۆن هەموو بەیانییەك ســـڵاو لە کەســـێك دەکەیت کە وەڵامت ناداتەوە؟

لاوەکەش گوتی: چی تێدایە ئەگەر من سڵاوی لێ بکەم؟

کابراش گوتی: لەم ماوە دوورودرێژەدا جارێك گوێبیستی وەڵامەکەی بوویت؟

ئەویش گوتی: نەخێر! کابراش گوتی: کەواتە بۆ ســـڵاو لە یەکێـــك دەکەیت کە وەڵامت ناداتەوە؟

لاوەکەش پێی گوت: بە ڕای تۆ چی وای لێ دەکات کە وەڵامی سڵاوەکەم نەداتەوە؟

کابرا گوتی: بێگومان لەبەرئەوەیە کە کەسێکی بێ ئەدەبو بێ ماریفەتە، شایانی ئەوە نییە سڵاوی لێ بکرێت.

لاوەکەش پرســـی: کەواتـــە بە ڕای تۆ ئەو کەســـێکی بێ ئەدەبە؟ کابراش گوتی: بێگومان!

لاوەکەش بە هێمنی پێی گوت: کەواتە تۆ دەتەوێت لەوەوە فێری بێ ئەدەبی ببم، یا فێری ئەدەبی بکەم؟

چونکە ئەگەر منیش سڵاوی لێ نەکەم فێری ئاکاری ئەو دەبمو وام لێ دێت، سڵاو لە کەس ناکەمو ئەو کات ئەو بەسەر مندا زاڵ دەبێتو فێری ئەو کارەم دەکات کە تۆ لات وایە بێ ئەدەبییە! بەو کارەش خاوەنی ئـــاکاری خراپ ســـەرکەوتوو دەبێت، بەڵام من بەو کارەم پارێزگاری لەو بەهاو بنەما بـــەرزەی خۆم دەکەم کە بـــاوەڕم پێیەتی، ئەویش ئەمرۆ، یا ســـبەی لە منەوە فێری ئاکاری جوان دەبێت!

**لەم چیرۆکەوە چی فێر دەبین:**

١- ئـــەم چیرۆکـــە گەورەترین وانەیە بـــۆ هەمـــوو هەوادارانـــی گۆڕینـــی ئاکارو هەڵسوکەوتی تاکەکانی کۆمەڵ کە بناغەی هەموو چاکخوازیو گۆڕانێکە.

٢- دەتوانیـــن بە پیشـــاندانی ڕەفتاری جوان ڕەفتارە ناشیرینەکان بسڕینەوە.

٣- گـــەر بمانەوێـــت کەســـانی دوور لە ڕەفتـــاری شارســـتانی فێـــری ڕەفتاری شارســـتانی بکەین، پێویســـتە بە ڕەفتاری جوانو شارستانی بەرپەرچی هەڵسوکەوتە خراپەکانیان بدەینەوە.

٤- دەبێـــت کەســـانی خـــاوەن ڕێبازی بـــەرزو ســـەرکردەکانی چاکخوازیـــو پەروەردە، پشوودرێژو ئارامگر بنو نابێت پەلە بکەن.

٥- کۆمەڵـــگای ئێمـــە پێویســـتی بـــە هەوڵو کۆششـــی زۆری دڵســـۆزان هەیە بۆ نەهێشتنی دیاردە دزێوەکان.

٦- نابێت ڕێگـــە بدەین خاوەن ئاکارو دیـــاردە دزێـــوەکان ڕەفتارەکانـــی خۆیـــان بگوازنـــەوە بۆ ئێمەو زاڵبن بەســـەرماندا، بەڵکـــو دەبێـــت ئێمـــە هەڵوێســـتەیان پێ بکەینو وایان لێ بکەین لەو کارە خراپانە پەشیمان ببنەوە.

٧- ئـــەو مرۆڤانـــەی خـــراپ ڕەفتـــار دەکەن، کەســـانێکی نەخۆشنو پێویستیان بـــە چارەســـەر هەیـــە، شـــایانی بەزەیـــی کۆمەڵـــگانو دەبێـــت بـــە چـــاوی ســـۆزو میهـــرەوەو بە هەســـتێکی نەرم دەســـتیان بگرینو هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکەینەوە.

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

# سەرکردایەتی

## بەشی سێیەم

هەموو بوارێکی ژیان هەوڵو ماندووبوونی دەوێت، بەڵام ئەوەی گرنگە چۆنییەتی هەنگاونانە لەسەر چەند بنەمایەك بۆ ئەوەی بگەین بەو شتەی کە دەمانەوێت لە ژیان، سەرکردەش بۆ ئەوەی بگات بە پلەی سەرکردایەتیکردن دەبێت پەیڕەوی چەند بنەمایەك بکات لە ڕێگا ئەو هونەرە نهێنییەی کە هەیەتی، لێرەدا نابێت لەوەدا بە هەڵەدا بچینو وا تێبگەین کە ئەرکی سەرکردایەتیکردن کارێکی زانستییەو پێویستی بە باکگراوندێکی تەواو زانستی هەیە، چونکە ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە ڕەنگە سەرکردایەتی ئەوەندەی پێویستی بە هونەری هەڵسوکەوت کردنو سەرنجڕاکێشان هەبێت ئەوەندە پێویستی بە لایەنە زانستییەکە نییە "دەبێت هەمیشە لە خەیاڵتدا بێت کە سەرکردایەتی هونەرە، زانست نییە. لەوانەیە بەڕێوەبردن زانست بێت، بەڵام سەرکردایەتی کاریگەر هونەرە".

کەواتە بۆئەوەی سەرکردە بگات بە مەرامە هاوبەشەکانی خۆیو دەوروبەرەکەی لە پێناو شوێنکەوتووەکانیدا دەبێت هەوڵەکانی چڕکاتەوە لەسەر چوار بنەما کە لێرەدا لە چوار بەشی جیاوازدا لێ دەکۆڵینەوە:

یەکەم/ دەسەڵات:

"دەسەڵات بریتییە لەو پلە و پایە فەرمییە کە کەسەکان بەدەستی دەهێنن" یان ئەگەر دەسەڵات بە جۆرێکی تر پێناسەی بکەین "دەسەڵات بریتییە لە ڕاسپاردنی یەکێك لە تاکەکان کە هەڵسوکەوتی پێویست بکات بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو لە ڕێگای دەرکردنی بڕیارو فەرماندا" کە دواتر ئەو کەسە هەڵدەستن بە پراکتیزەکردنی ئەو دەسەڵاتە لەسەر کۆمەڵەکەیدا بە پێی ئەو ڕێساو یاسایانەی کە بۆیان دانراوە لە لایەن ئەو دەزگا کارگێڕییەی کە دەسەڵاتی پێداوە، کە ئێمە لێرەدا ئەوەی مەبەستمان سەرۆکو بەڕێوەبەرەکانە.

بەڵام ئەم حاڵەتە سەبارەت بە سەرکردەکان جیاوازن لە ڕووی چەمکەوە، چونکە سەرکردەکان دەسەڵات لە کۆمەڵە کەسێك وەردەگرن بە تایبەتی ئەو کۆمەڵە کەسانەی کەوا لەگەڵیان کاردەکەن "بەپێی ئەو جۆرە دەسەڵاتەش هانی کەسەکان دەدات بۆ ئەنجامدانو جێبەجێکردنی کارەکان ئەویش بە ڕەچاوکردنی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان، چونکە ئەم لایەنە ڕۆڵێکی ئەکتیڤی هەیە لە پێشخستنی ئامانجی کەسە شوێنەکەوتووەکانیدا، ئەمەش وا لە سەرکردەکان دەکات لە بواری ڕێکخستنو بڕیارداندا خێرایییەکی تەواویان هەبێت".

تێکەڵ بوونو ئاڵۆزی هەیە لە بۆ چوونەکان بۆ وشەی سەرکردەو دەسەڵاتەکەی، چونکە کاتێك باس لە ڕۆڵی سەرکردەو گرنگیو بنەماکانی سەرکردایەتیکردن دەکەین هەمیشە بە بۆچوونێکی سەربازیانە وێنەی سەرکردە لە هزری خۆمان دروست دەکەین "بە تایبەتی لەو کاتەی کە دەڵێین: (سەرکردە) زۆرینەی کەسەکان بۆچوونیان وایە لە جەنگە هەلگیرساوەکاندا یەکە سەربازییەکان لە کاتی هێرش بردنو پێکداداندا سەرکردە پێشەوایەتیان دەکات، کەچی لە زۆربەی ئەم حاڵەتە جەنگیانەدا (جەنەڕاڵ) بەرپرسە لە سوپاو یەکە سەربازییەکاندا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان".

کەواتە بەشێوەیەکی بەردەوام ئەم جۆرە تێڕوانینو بیرکردنەوانە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر بیرو بۆچوونمان دەربارەی چەمکی پێشەواو سەرکردایەتیکردن، بە جۆرێك ئەو کاتەی لە گفتوگۆکانمان باس لە سەرۆکو سەرکردەکان دەکەین قسەکانمان پڕیەتی لە بەکارهێنانی وشەی سەربازی بۆیە بەکارهێنانی هەر وشەیەك لە جیاتی شتێکی تر دەبێتە لە ناو بردنی مانا ڕاستەقینەکەی ئەوی تر.

بۆئەوەی ڕزگارمان بێت لە تێکەڵکردنی چەمکەکانو لێك جوداکردنەوەیانو بە دیارخستنی جیاوازی دەسەڵاتی سەرۆك سەرکردە، ئێستا پێویستمان بەوە هەیە کە بە شێوەیەکی ڕوونو دیاریکراو جیاوازی بکەین لە نێوان سەرۆکو سەرکردە لە ڕوانگەیەکی نوێ ترو جیاوازتر بۆ ئەو دوو پۆستە:

* سەرۆك کەسانێکی هەیە کە پابەندن بە خزمەتکردن بە پێی یاسا، سەرکردە سەربازی نوێی هەیە بە بێ ئەوەی پابەند بن.

* سەرۆك هێزی لە دەست دایە، بەڵام سەرکردە کاریگەری هەیە لەسەر شوێنکەوتووەکانی.

* سەرۆك پشت دەبەستێت بە دەسەڵات بەپێی پلەو پایە بە هێزەکەی، بەڵام سەرکردە دەسەڵات بە دەست دەهێنێت.

* سەرۆك دەتوانێت بە ترسو پابەند بوون ڕێز بۆ خۆی دروست بکات، بەڵام سەرکردە خۆی شایەنی ڕێزە، چونکە سەرۆك دەڵێت: (من وادەکەم)، بەڵام سەرکردە دەڵێت: (ئێمە وادەکەین).

* سەرۆك تەنها دەزانێت بارودۆخەکە چۆن دروست بوو، بەڵام سەرکردە دەزانێت بارودۆخەکە چۆن دروست دەبێت.

* سەرۆك خەڵك ناچار دەکات لە هەستان بە کردار، بەڵام سەرکردە ویستی کرداریان لا دروست دەکات.

* سەرۆك برادەرەکانی خۆی رادەماڵێت، بەڵام سەرکردە فێریان دەکات.

دووەم/ رۆشنبیریو زانیاری:

رۆشنبیریو زانیاری دووەمین بنەمای بنەڕەتییە بۆ سەرکردە. کەواتە دەتوانیت ببیتە پێشەواو سەرکردە بەو زانیاریەی کەوا بە دەستت هێناوە. بۆ نموونە لەو کاتەی سەیارەکەت تێکدەچێت، دەتوانی ببەیتە لای فیتەر بۆ چاك کردنەوەی، یاخود لەو کاتەی کەوا کۆمپیوتەری تایبەتت لە کار دەکەوێت ئەوەی لە دەسەڵاتت دایە دەتوانیت بە کاری بهێنی بۆ چاك کردنەوەی، بەڵام زۆربەی جار داوای یارمەتی دەکەیت لە کەسێکی تایبەتمەند لەو بوارە. کەواتە لە توانای میکانیکەکان، یان پزیشکییەکان، یاخود پارێزەران، یان مامۆستایاندا ببن بەسەرکردە بەو زانستو زانیاریانەی کەوا بەدەستیان هێناوە لە بواری پسپۆڕی خۆیاندا، بەڵام زانستو زانیاریش بە تەنها بەس نییە بۆ ئەوەی تۆش ببیتە سەرکردە، بەڵکو پێویستە بیر لە باشترین مامۆستا بکەیتەوە، یان راهێنەری کاریگەر بۆئەوەی سوود لە ئەزموونی ئەوان وەرگریت، ئەوانەی کە جیاواز بوونە سەبارەت بە تۆوە.

زانست یەکێکە لەو ئامرازانەی کە سەرکردە دروست دەکات، چونکە کەسی بێ زانست دەتوانین بڵێین دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی سەرکردایەتیکردن، واتە ئەو کەسەی زانیاریو رۆشنبیرییەکی ئەو تۆی نییە ناتوانێت کەسەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو سەرکردایەتیان بکات، هیچ شتێکی پێ نییە بۆئەوەی پێشکەشی کۆمەڵەکەی بکات لە بواری پلاندانانو چۆنییەتی جێبەجێکردنی نەخشەکان، زانستیش نەك سەرکردەکان بەڵکو مرۆڤ بە گشتی جوان دەکات هەروەك چۆن (تاوس) پەڕەکانی جوانی دەکەن.

کەواتە ئەگەر سەرکردە بێ زانست بوو دەبێت بەردەوام داوای یارمەتیو زانیاری لە شوێنکەوتووەکانی بکات، بەڵام خۆی لە بنەڕەتدا پێچەوانەیە، چونکە سەرکردە بە دەر لە خۆی دەبێت لە جیاتی کۆمەڵەکەشی بیربکاتەوە، بۆیە زانیاریو رۆشنبیری یەکێکە لە گرەنتییەکانی سەرکردەی کاریگەرو کار، چونکە "سەرکردە تەواو پیاوێکی داهێنەرە، کە دەتوانیت زۆر بە ئاسانی جیاوازی بکەی لە کێشەیەك بەرلەوەی ئەو بێتە ناو کێشەکەوە، لەگەڵ ئەو کاتەی کە ئەو هاتووەتە ناو کێشەکەوە، چونکە لە هەمبەر کێشەکاندا نەرمو لەسەر خۆیە، دەتوانێت بە ئاسانی بەسەر کێشەکاندا زاڵ ببێت، ئەو کۆمەڵە کەسەی کە لەگەڵی کاردەکەن بە لای ئەوە لە هەموو شتێك گرنگترە".

گەر سەرکردەکان بەم شێوەیە بیرنەکەنەوەو هەوڵی زیاتر خۆپێگەیاندنی خۆیان بە زانستو زانیاری لە پێناو کۆمەڵەکەی کە ئەو خۆی بەسەرکردەیان دەزانێت نەدەن، ئەوا ناچارین بڵێین: "رەنگە زەمانە وای لێکردبێت کە ئەو دەسەڵاتی هەبێت، بەڵام شوێنکەوتووەکانی بەبێ ئەو بە دڵنیاییەوە سەریان سوکترە" بوونی ئەم جۆرە خراپترە لە نەبوونی سەبارەت بە کۆمەڵەکەی، یاخود ئەو شوێنەی کە ئەو سەرکردە هەڵسوکەوت دەکات.

سێیەم/ شێوازی سەرکردایەتیکردن:

سەرکردەکان شێوازو زانیاری جیاوازیان لە دەسەڵاتەکانیان بەکار دەهێنن، واتە دەکرێت مامۆستا ببێتە سەرکردە بەو زانیارییەی کەوا هەیەتی، ئەو پلەو پایەی کە پێی سپێردراوە، هەندێجار سەرکردە دەکرێت کەسایەتییەك بێ دەسەڵاتێکی فەرمی هەبێت، بۆ نموونە وەکو بەڕێوەبەر، یان وەکو ئەفسەری سوپا، یاخود سیاسەتمەدارێکی لێهاتوو.

بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناتوانیت خۆت وا دابنێی کە کەسێکی نموونەییو دەبێ هەموو خەڵك بکەونە شوێنت "چونکە لەم شێوازە سەرکردایەتی کردنەدا دەبێت خەڵك تۆ بخەنە ئەو شوێنە نەك خۆت خۆت بخەیتە ئەو شوێنە، کەواتە دەبێت خەڵك بە سەرکردەیەکی نموونەییت بزانن، کە هەندێجاریش کەسێکی نەویستراو دەبیت لە لایەن خەڵکەوە".

هەروەها راهێنەرانیش لە توانایاندا هەیە ببنە سەرکردە، یاریزانی تێنسی بەریتانی (غریغ روسکی) لە پلەی (٥٦) لەسەر ئاستی جیهان گەیشت بە پلەی (٦)م بە چەند مانگێکی کەم لە ژێر چاودێریو سەرپەرشتی راهێنەرەکەی دا، چونکە هەر لە بنەڕەتدا (روسکی) یاریزانێکی بەهرەمەند بوو، راهێنەرەکانی توانیان پاڵی پێوەبنێن بۆ ئەوەی یاری بکات بە هەموو ئەو بەهرەیەی کەوا هەیەتی، یاریزانەکانی جیهان هەموویان سەرکردەو نموونەن، ئەم حاڵەتە بۆ هەموو بوارەکانی تری ژیان دەشێ، بۆ نموونە پزیشك دەتوانێت ببێتە سەرکردە، ئەوەش لە چوارچێوەی ئەو زانیاریانەی کەوا بە دەستی هێناوە، بە چارەسەرکردن دەتوانن سەرکردایەتی خەڵك بکەن بۆ تەندروستییەکی باش. ئەم هەنگاوانەی کە لە بواری وەرزشیو پزیشکی ئەنجام دراوە نیشانەی سەرکردایەتی پێوە دیارە، ئەمەش لە ئەنجامی بەرجەستەکردنی چەند سیفەتێکی سەرکردایەتی کردنی، چونکە یەکێك لە سیفەتەکانی کەسی سەرکردە "باوەڕی بە ورە بەرزی هەیەو هەستی سەرکردایەتی کردنی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا پێشهات ناسە لە هەمبەر رووداوو بارودۆخەکان".

ئایا لە چ بوارێك لە ژیانتدا دەوری سەرکردەت بینیوە؟ لە چ شوێنێکدا دەسەڵاتت هەبووە چ بەشێوەیەکی فەرمی، یان بە نا فەرمی؟ ئایا لە چ بوارێك زانیاری زۆرترت بە دەست هێناوە لە خەڵکانی تر؟ لەو بوارانەی کەوا بە سەرکردە دادەنرێیت چۆن دەتوانیت کاریگەری زۆرت هەبێت؟ ئایا تۆ تا چ رادەیەك نەخشە دارێژەری؟ لە چ بوارێك دەتوانیت نەخشە دارێژی بۆ ژیانی کەسانی تر؟ ئایا لە چ بوارێکدا دەتوانیت باشترین ئەو شتانە بەدی بێنیت کە لە کەسانی تردا نییە؟ ئایا شێوەی سەرکردە چۆنە لە لای تۆ؟ چۆن دەتوانیت شتەکان پێش بخەیت زیاتر لە ژیانی خۆتدا، یان فراوانی بکەیت لەوەی کە لەبەر دەستتدایە؟

هەموو ئەم پرسیارانە پێویستی بە وەڵامێکی راستو دروست هەیە، ئەو کاتە پێوەرێکت دەست دەکەوێت هەر ئەو پێوەرەشە، یاخود ئەو ئەنجامەیە پێت دەڵێت ئایا تۆ سەرکردەی، یان کەسێکی ئاسایی وەکو هەر تاکێکی تر؟ بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ئەو وەڵامانەی کە دەستمان دەوکەوێت، لەسەر ئەو بڕیارو کارانەی کە لەسەر بنەمای زانیاریو شێوازی پیشەکەمان ئەنجامی دەدەین لە روانگەی کاریگەریو کاردانەوەکانی بڕیارو کارەنمان پلەی سەرکردایەتیمان پێدەدرێت، جا لێرەدا گرنگ نییە پێدانی ئەو دەسەڵاتە فەرمی بێت؟ یان نا فەرمی؟ بەڵکو گرنگتر ئەوەیە کە دەگەین بەو شوێنە خوازراوە بەپێی کەسایەتیو تایبەمەندییە جیاوازەکانی کەسایەتی خۆمان "تۆ ئەگەر لە ژیاندا قسە لەسەر سەرکردەیەك، یاخود کەسێکی ئاسایی بکەیت، دەبینی شێوازو کەسایەتی تایبەتی خۆی هەیە، ئیدی ئەو کەسە پزیشك بێت، یان سیاسەتمەدار، یاخود رۆژنامەنووس".

# 4 خاڵی سەرەکی بۆ هەڵسوکەوت کردنی بەڕێوەبەر لە گەڵ فەرمانبەراندا

بەشی دووەم و کۆتایی

ئا: ئیحسان شەریف ساڵح

خاڵی سێیەم: سەرزەنشتکردن

بەڕێوەبــەر دەبێت هەر لەو کاتەی کە فەرمانبەر هەڵەیەکی کرد، فەرمانبەرەکە سەرزەنشت بکات.. نابێت هەموو هەڵەکانی فەرمانبــەر کۆ بکرێتــەوە، دوایی لە کاتی نەمانی ئارامیی بەڕێوەبەر هەموو هەڵەکان بە یەکەوە بە فەرمانبەر بگوترێت.

سەرزەنشــتکردنی فەرمانبەریــش پێویستە بکرێتە دوو بەش:-

بەشی یەکەم: کاتێك فەرمانبەر هەڵەیەك دەکات تواناشــی هەبێــت.. هەڵەکــە نەکاتو کارەکــەی بە باشــی ئەنجام بدات.. لە ســەر بەڕێوەبەر پێویستە، فەرمانبەرەکە سەرزەنشت بــکات. هەر ئەو کاتەی کــە بەڕێوەبەر زانی فەرمانبەرەکــەی هەڵەیەکی کــردووە دەبێت بــڕوات بۆ لایو دەبێت سەرزەنشــتی بکاتو پێی بڵێت: کە چ هەڵەیەکی کردووەو هەڵەکە بە دروســتی دەستنیشــان بکات، کە لە کوێی کارەکەیدا هەڵەی کــردووە.. فەرمانبەریش کە دەبینێت، دەزانێت بەڕێوەبەر بە دروستی هەڵەکــەی دەستنیشــان کــردووە، دەزانێــت کــە بەڕێوەبەرەکەی بە تەواوی شــارەزایەو ناتوانێت کارەکەی بە نارێکیو گاڵتە ئەنجام بدات.

دەبێت بە فەرمانبەرەکە بگوترێت کە چ هەستێکی خراپی هەیە. لە بەرامبەر ئەو کارەی کــە بە هەڵە کردوویەتی.. لە کاتی سەرزەنشتکردنیشدا نابێت هێرش بکرێتە سەر کەســێتی فەرمانبەر.. بەڵکو دەبێت لەسەر هەڵســوکەوت سەرزەنشت بکرێت.. هەروەها لە کاتی سەرزەنشتکردندا دەبێت بەڕێوەبــەر چەنــد چرکەیــەك بێدەنگ بێت.. تا فەرمانبەر بزانێت کە بەڕێوەبەر لەو هەڵەی کردوویەتی چەند نیگەرانە.

بەشــی دووەمی سەرزەنشت: لە بەشی دووەمی سەرزەنشتکردندا دەبێت بە باڵای فەرمانبــەردا هەڵبگوترێت.. تا فەرمانبەر بزانێــت کە کەس کێشــەی لەگەڵدا نییە. ئەویش بەم شێوەیە دەبێت:

دەبێت بەڕێوەبــەر بە بیر فەرمانبەر بهێنێتەوە کە مەبەســتی هاوکاری کردنی فەرمانبەرە بە شــێوەیەکی ڕاســتگۆیانەو دەبێت پێــی بگوترێت.. لە لای بەڕێوەبەر چەنــد بەڕێــزەو چەنــد جێگــەی ڕێزەو چەند خۆشەویســتە. دەبێــت پێی بڵێت.. متمانەیەکی تەواوی پێی هەیەو باوەڕێکی زۆری پێی هەیە، تەنیا نارەزایی بەرامبەر ئــەو هەڵەیــە هەیــە، کــە کردوویەتی.. ئەویــش لە لایــەن بەڕێوەبەر پێشــبینی نەکــراو بوو، ئەو هەڵەیــەی لێ ببینێت.. چونکــە بڕوایەکــی زۆری پێــی هەیــە. دەبێــت بەڕێوەبەر ئەوەی لە بیر نەچێت کە پێویســتە سەرزەنشــتکردن ماوەیەکی کەم بخایەنێــتو دوای تەواوبــوون، هیچ کاتێکــی دیکە لەســەر ئــەو هەڵەیەی کە پێشتر سەرزەنشت کراوە، دووبارە کەسەکە سەرزەنشت نەکاتەوە.

چوارەم: گرنگیدان بە کات:

گرنگتریــن شــت بۆ هەر کەســێك لە ژیاندا کاتە، لە سەر بەڕێوەبەریش پێویستە گرنگییەکــی زۆر بدات بــە کاتو لە کاتی ئەنجامدانی هــەر کارێکدا، کات لەبەر چاو بگریــت.. هەتا کاتێك لەگــەڵ فەرمانبەردا هەڵســوکەوت دەکات.. دەبێــت هەوڵ بدات

کەمترین کات بخایەنێت. بۆ نموونە: لە کاتی دیاریکردنی ئامانجدا، دەبێت کاتێکی زۆر کەم، بۆ دیاریکردنی ئامانج تەرخان بکات. واتە بۆ دەستنیشان کردنی ئامانج بۆ فەرمانبەرێك، کاتێکی زۆر بە فیرۆ نەدات. بەمەش دەتوانێت ئامانج بۆ زۆربەی فەرمانبەرەکانی خۆی دیاری بکات.. چونکە کاتێکی کەم بۆ دیاریکردنی هەر ئامانجێك دادەنرێت، ئەگەر تەماشای زۆربەی بەڕێوەبەرەکان بکەین.. دەبینین کە ناتوانن ئامانج بۆ فەرمانبەرانی خۆیان دیاری بکەن.. چونکە ئەو کاتەیان نییە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە گرنگی بە کات نادەن. هەروەها کاتێك کە فەرمانبەرێك کاری خۆی بە باشی ئەنجام دا، بەڕێوەبەر دەبێت لە ماوەیەکی کەمدا بە باشترین شێوە ڕێزی ئەو کارەی کردوویەتی دابنێتو هانی بداتو پێیدا هەڵبڵێت. ئەمانەش دەبێت لە کاتێکی زۆر کەمدا بکرێت.. چونکە بەڕێوەبەر ناتوانێت هەر کاتێك کە فەرمانبەرێك کارێکی بە باشی ئەنجام دا، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر دەستخۆشی لێ بکاتو هانی بداتو پێیدا هەڵبڵێت.. چونکە لەوانەیە ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەران کارەکەیان بە باشی ئەنجام بدەنو پێویستیان بە پێدا هەڵگوتنو دەستخۆشیو هاندان بێت.. بۆیە دەبێت لە ماوەیەکی کەمدا بە باشترین شێوە دەستخۆشیو هانی فەرمانبەر بدرێت.. بۆئەوەی بتوانرێت لە ماوەیەکی کەمدا هانی ژمارەیەکی زۆر لە فەرمانبەر بدرێت کە پێوستیان بە هاندانە. هەروەها کاتێك فەرمانبەر هەڵەیەکی کرد.. دەبێت سەرزەنشتکردنی فەرمانبەر لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بکرێت، بۆ ئەوەی کاتمان بە فیرۆ نەدەین.. لە سەر شتی ڕۆیشتوو وا لە فەرمانبەریش نەکرێت وا هەست بکات ناتوانێت سەرکەوتوو بێت لە کارەکەیدا، سەرزەنشتکردن تەنها بۆ ئەوەیە.. فەرمانبەر بزانێت کە چ هەڵەیەکی کردووەو پەند وەربگرێت لەو هەڵەیەی کردوویەتیو بزانێت.. بەڕیوەبەر ئاگای لێی هەیەو ئەم سەرزەنشت کردنەش دەبێت کاتێکی کەم بخایەنێت.. تا بتوانرێت ئاگاداری ئەو هەڵانەی دیکە بێت کە دەکرێن لە لایەن فەرمانبەرانی دیکەوە.. چونکە ئەگەر کاتێکی زۆر تەرخان بکرێت بۆ هەڵەیەك ئەوا ناتوانرێت کات دابنرێت بۆ بە دواداچوونی هەڵەکانی دیکە هەرچەند باشیش نییە.. زۆر لەسەر هەڵەیەك بڕۆین کە کرا بێت.

# پەیوەندی سەرکەوتووانە

ئاوات جەمال

پەیوەندیکردن ئەمڕۆ بە یەکێك لە گرنگترین چالاکییەکانی سەردەم دەژمێردرێت کە بەڕێوەبەری کارگەیەك، یان کۆمپانیایەك پێی هەڵدەستێت، چونکە ئەم بابەتە یەکێك لە هەرە دیاردەکانی کێشەی کارگێڕی بوو بە شێوازە کۆنەکەی کە خۆی دەبینییەوە لە یاداشتنامەو ڕاپۆرتو ڕاپۆرتکاری، یان کورتە وتوووێژەکاندا کە ئەنجام دەدران، ئەمانەش خۆی لە خۆیاندا کاتێکی زۆریان پێویست بوو کە دەبوایە بەڕێوەبەر بیکوژێت پێیانەوە، بۆ گەیشتن بە چەند خاڵێك کە چاکسازی لێوە بەدی دەهات هەر هەمووشی لەسەر حسابی کارو پشوودان بوو.

وەك لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکاندا بە ئەنجام گەیشتوون پەیوەندی ئەو رووبەرە فراوانە داگیر دەکات لە کۆی گشتی کاتەکانی بەڕێوەبەر بە خەریك بوونیانەوە بە پێشوازیکردنو نامەناردن، یان وەڵامدانەوەی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان لە زەمانێکداو مۆبایل لەم سەردەمەدا. تێکڕای ئەو ماوە کاتیانە بە ڕێژەی ٧٥٪ دەخەمڵێنرێت لەمەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە سێ چارەکی کاتت بە پەیوەندی دەبەیتە سەر. جا ڕات چۆنە ئەگەر جۆری ئەم پەیوەندییانە شکستهێن بنو سەرکەوتوو نەبن. کەواتە ئەو جۆرە بەڕێوەبەرانە واتە کاتێکی زۆریان بە فیرۆ داوەو زەرەرمەند بوون لە کارەکانیاندا.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو دەزانێت چۆن نامە دەنووسێتو چۆن وەڵامی کورتو پوختی بریکارەکانی دەداتەوە، بەڵام بە داخەوە زۆربەی بەڕێوەبەرەکان لە شارەزایی ئەم جۆرە پەیوەندیانەیاندا لێهاتوو نین. لای ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە کار دەگاتە ئەو ئاستەی کە ئیرەیی دەبەن بە بەڕێوەبەرە سەرکەوتوو شارەزاکان، جا ئێمە لەم بەشەدا ئەو ڕێو شوێنو ڕێنماییەتان پێشکەش دەکەین کە دەمان گەیەنێتە دڵنیابوون لە چۆنییەتی دروستکردنی پەیوەندییەکی سەرکەوتووانە.

١- شارەزایی پەیوەندی دەستکەوتووە، نەك بۆ ماوەیی:

کاتێك لە دایك دەبیت، هاوار دەکەیت نەك قسە، دوایی فێری گفتوگۆو وتووێژ دەبیت، لە ڕێگای لاساییکردنەوەی کەسانی ترەوە، بۆیە پێویست دەکات لە سەرت کە خۆت فێرکەیت تا زیاتر شارەزا بیت.

٢- گریمان ئەو نامانەی کە دەیان نێرێت چاك لێی تێ ناگەن! ئەوە وات لێدەکات کە لە شێوازی بیرکردنەوەتو ڕێگای نووسینی نامەکانت گۆڕانکاری بکەیت تاکو بگەیت بەو مەبەستەی دەتەوێت پێی بگەی.

٣- بایەخ بە تێگەیشتن بدە، خۆت ئەم پرسیارە ئاڕاستەی خۆت بکە «چۆن دەتوانم بەم نامەیەم بە شێوەیەك بنووسمو ئاڕاستە بکەم کە بەرامبەرەکەم بە هەڵە لێی تێ دەگات».

٤- مانای وشەکان لە لای خەڵکی مەرج نییە هەمان مانای ناو فەرهەنگەکان بگەیەنێت پێناسەکان لە ناو فەرهەنگەکاندایە، بەڵام ماناکان لای خەڵکییە، بۆیە ئێمە پێناسەکان نانێرین بۆیە پێویستە بە ئاگا بین لە ناردنی نامەدا زیاتر مەبەستان ڕوون بێت.

٥- ماناکان لای خەڵکی ڕوون دەبێت بە شێوازی گفتوگۆ، زیاتر لەو قسانەی دەیکەیت. تۆنی دەنگت بەرزیو نزمی، تەنانەت جووڵەکانی لاشەت بەشدار دەبن لە پێکهێنانی ٩٠٪ واتاکان کە مەبەستە بیگەیەنیت.

٦- کاتی بە یەکگەیشتنی دوو کەس مانای پەیوەندی دەگەیەنێت ئەگەر خۆشیان کارەکەیان بێ مەبەست بێت. هەرچەندە تۆ هیچ مەبەستێکت نیە لەگەڵ کەسی بەرامبەرتداو بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت «واتە بێئاگایی» ئیحایەك لە تۆوە دەردەچێت بەرامبەرەکەت لێت تێدەگات.

٧- لە ٨٧٪ ئەو زانیارییانەی لای خەڵکی پاشەکەوت کراوە لە ڕێگای چاویانەوە چووەتە ژوورەوە، کاتێك وشەکانت لەگەڵ کردەوەکانتدا نەگونجاو بن ئیتر خەڵك بڕوا بە کردارەکانت ناکەن.

٨- پەیوەندی کارێکی ئاڵۆزو بەردەوامو گۆڕڕاوە، هەر ئاوا کارێکی ئاسانو سادە نییە وەك خەڵکی لێی تێگەیشتوون کە تەنها بریتییە لە چەند وشەی ئاڵوگۆڕ کراو. چونکە کاری پەیوەندی شکست خواردوو دەبێت ئەگەر بەردەوام نەبێتو هەوڵی ڕاستکردنەوە نەدرێت.

بەشی یەکەم

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

# بەڕێوەبردنی داواکاری

لە بابەتی ئەمجارەدا هەوڵ دەدەم ئێوەی خۆشەویست لەگەڵ پێناسەی داواکاری و بەڕێوەبردنی داواکاری ئاشنا بکەم و لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدەم جۆرەکانی داواکاری لەگەڵ خستنەڕووی پێشنیارەکان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ هەر یەك لە جۆرەکان بۆ باشتر بەڕێوەبردنی داواکاری و دۆزینەوەی بازاڕ بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی ڕێکخراو ڕوون بکەمەوە و لە کۆتاییشدا ڕۆڵی بەڕێوەبردنی داواکاری لە ڕووی بەڕێوەبردنی هەریەك لەو داواکارییانە دەخرێتە مەیدانی باسکردن.

پێشەکی:

یەکێك لەو پێناسانە کە بۆ زانستی بەڕێوەبردن بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت ئەوەیە کە دەڵێت: "بەڕێوەبردن زانست و تەکنیك، پلاندانان، (پێشبینیکردن)، ڕێکخستن (دابەشکردنی کارەکان)، ڕێنمایی و ڕابەرایەتی (ڕێنمایی کردن و توانای چوونە ناو دڵەکان)، چاودێری و کۆنترۆڵکردن، (چاودێری کردن و چاکسازی هەڵەکان) و دروستکردنی هەماهەنگی، (دامەزراندنی بیرۆکە و بناغەی سیستەم) لە نێوان تەواوی بەشەکانی ڕێکخراو و سەرچاوە جیاوازەکان (مرۆیی- نەختینەیی- فیزیایی) بۆ گەیشتن بە ئامانجە پێشبینی کراوەکانی ڕێکخراو لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئادات و ڕێساکانی ناو کۆمەڵگایە. ئەگەر ئەو پێناسەیە لە تەنیشت هەر وشەیەکی تر دابنرێت دەکرێت سوودی لێ وەربگیرێت. بۆ نموونە: بەڕێوەبردنی بەرهەمهێنان، بەڕێوەبردنی دارایی، بەڕێوەبردنی فرۆشراوەکان و بەڕێوەبردنی دۆزینەوەی بازاڕ بە مەرجێك کە وشەی دووەم بە باشترین شێوە پێناسە بکرێت بۆ زانستی بەڕێوەبردن.

چەمکی دۆزینەوەی بازاڕ:

چەمکی دۆزینەوەی بازاڕ بەو واتایە دێت کە ڕێکخراو دەبێت پێداچوونەوەی داواکاری و پێداویستییەکانی بازاڕێکی ئامانج بکات کە بە شێوەیەکی گشتی پێناسە کراوە، پاشان دەبێت هەوڵ بدات تاکو ڕەزامەندی کڕیارەکان (باشتر و بەهێزتر لە ڕکابەرانی تری ناو بازاڕ) دابین بکات. بە واتایەکی تر نرخ و بەهایەکی زیاتر بۆ کڕیارەکان دەخاتەڕوو. بە مەبەستی خستنەڕووی بەهایەکی زیاتر بۆ کڕیارەکان ڕێکخراو دەبێت باشتر و خێراتر لە ڕکابەران کار بکات، تاکو لە لایەن کڕیارەوە دەستنیشان بکرێت، بەڵام تەواوی کردارەکانی سەرەوە لە نوسینگەیەکی ئابووری ئەو کات بۆ ڕێکخراو سوودمەند دەبێت کە ڕێکخراو بتوانێت لە ماوەیەکی درێژ قازانج بکات و لە بازاڕدا بمێنێتەوە.

پاش پێناسەکردنی وشەی بەڕێوەبردن و زانینی چەمکی دۆزینەوەی بازاڕ دەکرێت بەم شێوەیە بەڕێوەبردنی دۆزینەوەی بازاڕ پێناسە بکەین کە بریتییە لە: [ شیکردنەوە و پێوانەکردن، داڕشتن و پلاندانان، خستنەڕوو و کۆنترۆڵکردنی پرۆگرامەکان بۆ بەرهەمهێنان، خستنەڕوو و پاراستنی کردار و ئەو مامەڵانە کە قازانجیان هەیە لەگەڵ کڕیارە دەستنیشان کراوەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە پێشبینی کراوەکانی ڕێکخراو].

ئەگەر سەرنجی پێناسەی سەرەوە بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە پێناسەی سەرەوە لە پێناسەکردنی دوو وشەی بەڕێوەبردن و دۆزینەوەی بازاڕ پێکهاتووە. واتە جێبەجێکردنی ئەرکە دیاریکراوەکان بە مەبەستی ئەنجامدانی مامەڵە پێش بینی کراوەکان لەگەڵ بازاڕی مەبەست و بەڕێوەبردنی بازاڕ و زانستی ناسینەوەی پێداویستی و دەستەبەرکردنیان بە هۆی مامەڵە کردنی سەرچاوەکان.

لە ڕاستیدا دۆزینەوەی بازاڕ تەواوی کردارەکان لە دروستبوونی بیرۆکە تاکو بەرهەمهێنان، دابەشکردن و خزمەتگوزارییەکانی پاش فرۆشتنی شتومەك لە خۆوە دەگرێت و بە هۆی پێوانەکردنی ڕێژەی ڕەزامەندی کڕیارەکان و چارەسەرکردنی کەم و کورتییەکان بیر لە مامەڵەکانی داهاتوو لەگەڵ کڕیارەکان دەکات. کەواتە بەڕێوەبردنی بازاڕسازی بەڕێوەبردنی داواکارییەکانە کە ئەویش لە شوێنی خۆی بەڕێوەبردنی پاراستنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان لە خۆوە

دەگرێـت، کەواتە ئەرکی بەرپرسـاییەتی بەڕێوەبردنـی بازاڕسـازی ئەوەیە کە بە هەڵسەنگاندنی شوێنو بارودۆخی ڕێکخراو لە بازاڕ، ڕێژەیەکی شـیاو لە داواکاری بۆ ڕێکخراو مسۆگەر بکات.

بـە شـێوەیەکی تـر، بەڕێوەبردنـی بازاڕسـازی بریتییـە لـە بەڕێوەبردنـی کردارەکانی داواکاری کە تیایدا شـیکردنو پێوانەکردنـی دەرفەتـەکان، داڕشـتنو پلاندانـان، کارگێـڕی، جێبەجێکـردنو کۆنترۆلکردنـی پرۆگرامەکان بە ئامانجی دروستکردنو پاراستنی کردارەکانی شیاوی بازاڕسـازی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراو ئەنجام دەدرێت.

کەواتـە سـێ زاراوەی بەڕێوەبردنـی دۆزینـەوەی بـازاڕ (Marketing management)و بەڕێوەبردنـی داواکاری (Demand management)و بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ کڕیارەکان (Relation management {customer{CRM) هەموویـان لـە یەك ئاسـتو بە یەك واتا دێنو ئامانجیان بەڕێوەبردنی کڕیارو داواکارییەکانی ئەوانە بە شێوەیەك کە لە کڕیارێکی ڕۆژانە ببێتە کڕیارێکی هەمیشـەییو بە دروسـتکردنی پەیوەندییەکـی درێژخایـەن لەگەڵیـان پەیوەندییەکی قوڵی برایەتیو هاوکاری بە ئامانجی براوەی دوو لایەنە دروست بکات.

داواکاری چیە؟

داواکاری هەمان خواستو پێداویستییە کە لە توانای کڕین پێکدێت. پێداویسـتی هەسـتێکی نەبوونـە کـە لە بەردەسـت نەبوونی شـتێك لە ژیانی مرۆڤ دروست دەبێـت، خواسـت هەسـتێکی خۆشـە کە بـە هـۆی بـە دەسـتهێنانی شـتومەكو خزمەتگـوزاری دروسـت دەبێت، بەڵام بۆ گەیشـتن بەو هەستە خۆشە کڕیار دەبێت داوای کڕینی شتومەك بکاتو ئەنجامی ئەو کردارە بەشـێکی زۆر لە کارو کردەوەکانی ڕێکخـراو پێك دەهێنێت کـە بتوانێت بە هۆی بەکارهێنانی هۆکارەکانی پێشـکەوتن کە بریتین لە ڕیکلام، هۆکارە گشتییەکان، فرۆشتنی تاك، بەرەوپێشبردنی فرۆشتنو دۆزینەوەی بازاڕی ڕاسـتەوخۆ کڕیارەکان بـەرەو ڕێکخـراو ڕابکێشـرێتو پـاش فرۆشتنی بەرهەم کە بە هۆی بەکارهێنانی سیسـتەمەکانی فرۆشـتنو زانسـتی دەرونزانییەوە دەبێت پەیوەندییان لەگەڵ دروسـت بکاتو بە هـۆی پێداچوونەوەی پێویسـتو کاریگـەرو پێشکەشـکردنی خزمەتگوزارییەکانـی پـاش فرۆشـتنی شتومەكو پێوانەکردنی ڕێژەی ڕەزامەندی کڕیـارەکان (CSM) بـۆ زیاترکردنـی ڕەزامەنـدی کڕیـارەکان لـە ڕێکخـراو هەوڵ بدرێتو بۆئـەوەی کڕیارەکان ببنە کڕیارێکی وەفادار.

جۆرەکانی داواکاری:

زانایان جۆرەکانی داواکاری بە هەشت گروپ دابەش دەکەن، کە ئەوانیش بریتین لە: داواکاری نێگەتیڤ، نەبوونی داواکاری، داواکاری شـاراوە، داواکاری نزمبوونـەوە، داواکاری وەرزی، داواکاری تەواو، داواکاری زیادە، داواکاری ناپاك.

ئەگـەر قبوڵ بکەین لـە دونیا هەموو شتێك بێجگە لە خۆی گۆڕانی بەسەردا دێت، خاڵی گرنـگ ئەوەیە کە لە داواکارییەکانی جۆراوجـور بە هـۆی کاتو تەکنەلۆژیا لە لایەن کڕیـارەکان گۆڕانی بەسـەردا دێتو ئەرکی پیاوانی بەڕێوەبەری دۆزینەوەی بازاڕ بەڕێوەبردنی داواکارییەکانە بۆ گەیشتن بە ئامانجە دیاریکراوەکانی ڕێکخراو.

بەڕێوەبردنی داواکاری:

١- داواکاری نێگەتیـڤ: ئـەو جـۆرە داواکارییـە ئـەو کات دروسـت دەبێت کە داواکاری لەسەر بەرهەمێکی دیاری کراومان نەبێـت، یـان خراپتر لـەوە بەرامبەر ئەو بەرهەمـە کاری تێکدەرانـە بە مەبەسـتی نەمانـی بەرهەم ئەنجـام بدرێت. لەوانەیە بتوانرێـت شـێوازی ڕووبەڕووبوونەوە کە لە شـارە بچووکەکانو گونـدەکان، لە کاتی هاتنەکایەی ڕۆنی دەستکرد بەراورد بکرێت لەگـەڵ ڕۆنـی ئـاژەڵ، وەك نموونـە باس بکرێت لە کاتێکدا کە ئەمڕۆ داواکاری لەسەر ڕۆنی ئاژەڵ گۆڕانی بەسـەردا هاتووە. بەڵام بە شـێوەیەکی گشـتی زیاتر لە بازاڕەکانی سیاسـیو ڕامیاری ئەم جـۆرە داواکارییانە دەبینرێتو هەستی پێ دەکرێت.

ڕۆڵـی بەڕێوەبەری دۆزینـەوەی بازاڕ لـە کاتی ڕووبەرونەوە لەگـەڵ ئەم جۆرە داواکارییانە گۆڕینـەوەی داواکاری، یاخود گۆڕینەوەی بازاڕسـازییەو دەبێت ڕۆڵێکی گرنگ نیشـان بدات لە دۆزینەوەی بازاڕو دەست بەسەرداگرتنی لە ڕووی چۆنییەتی پێناسەکردنی بەرهەم لەگەڵ بەکارهێنانی توانـای ڕیکلامو بانگـەوازی بۆ دەربڕینو پیشاندانی سیمایەکی تر لەو بەرهەمە.

٢- نەبوونی داواکاری: مانای ئەو جۆرە داواکارییـە ئەوەیـە کە داواکاری لەسـەر ئـەو بەرهەمە لە بازاڕ نییە، لە ڕاسـتیدا بەڕێوەبردنـی ئـەم جـۆرە داواکارییە لە بەڕێوەبردنی داواکاری نێگەتیڤ ئاسانترە. بەڕێوەبـەری دۆزینـەوەی بـازاڕ لە کاتی ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ ئـەم حاڵەتە دەبێت سـەرەتا ئەم بابەتە بە شێوەیەکی وردو بە گۆشـەنیگایەکی زانسـتی لەگەڵ بەدەسـتهێنانی زانیـاری پەیوەندیدار لە بـازاڕ لێك بداتـەوەو دەرفەتەکان بە نرخ بزانێـت، چونکە لەوانەیـە ئەو بەرهەمە لەگەڵ فەرهەنگو ڕەسەنی کڕیار نەگونجاو بێت کەواتە لـەو حاڵەتە ڕێکخراو دەبێت هەندێ چارەسەری گونجاو ڕەچاو بکات.

بـەڵام لە زۆربەی حاڵەتـەکان ئەگەر بەرهەم خاسییەتو توانای بەرزی هەبێت (لە کاتێکدا کە کڕیار زانینی باشـی لەسەر نەبێـت)، دەبێت بـە هـۆی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاو ڕیکلامی بەهێزو خەرجکردنی تێچوونەکانـی پێویسـت بە شـێوەیەکی زانسـتیانە هەوڵ بدات خەڵکانی کۆمەڵگا ئاشـنا بـکات، لەگـەڵ ئـەو بەرهەمە بە شـێوەیەك کە خەڵك داوای ئەو بەرهەمە بکاتو ئەو بەرهەمە بکڕێت.

٣- داواکاری شـاراوە: لـە هەنـدێ حاڵەتدا کڕیارەکان داواکارییەك پێشکەش دەکەن بـەڵام چونکـە تاکو ئێسـتا هیچ ڕێکخراوو کۆمپانیایەك بیر لەم داواکارییە نەکردووەتەوە ئەو داواکارییە بە شـێوەی شـاراوەو نادیار دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕێکخراوێك بەرهەمێك بۆ وەڵامدانەوە بەو داواکارییە پێشکەش بکات دەبینین کە بە تێچوونێکی زۆر کەم دەتوانێت ڕەزامەندی کڕیارەکان بەدەسـت بهێنێـتو وابکات کە کڕیار ڕوو لەو بەرهەمە بکات.

بەڕێوەبردنـی دۆزینـەوەی بـازاڕی ڕێکخـراو لـە کاتـی ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ داواکاری شـاراوە ئـەو داواکارییە دەدۆزێتـەوەو بەرهەمێکی بـاش دەخاتە بەردەم کڕیارەکان، یەکێك لە تێبینیەکانی پەرتووکی زۆر بـە نرخی "پێنج فرمانی بیرۆکەی سـتراتیژی" دەڵێـت: لە جیاتی وەڵامدانەوە بە پێداویسـتییەکانی دۆزراو بیر لە وەڵامدانەوەی ئەو پێداویسـتییانە بکـەن کـە نەبینـراوە. ئـەو تێبینییـە دەتوانێـت بناغـەی دروسـتکردنی کارو داهێنانی بەرهەمی نوێ بێت.

ئاساییە کە سـەرقاڵ بوون بەم جۆرە داواکارییە پێویستی بەو کەسانە هەیە کە وردتر تەماشای بازاڕو داواکارییان دەکەنو بە هیچ شێوەیەك ڕازی بوونیان پێوە دیار نییەو هەمیشـە بیر لەو بابەتە دەکەنەوە کە ئایا دەتوانن داهێنانێکی نوێ پێشکەش بکەن؟ ئەگەر ئێمەش باش بیر لەو قسەیە بکەینـەوە بۆمـان دەردەکەوێـت کە ئەم جیهانە لەو کەسانە پێکهاتووە کە هەمیشە ناڕازیـن، چونکـە ئـەو کەسـانە کە بەم بارۆدوخە ڕازین هیچ جووڵەیەك نانوێنن بەرامبەر بە گۆڕانی حاڵەتەکە.

وەهاب حەسیب محەممەد

# بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاری نووسینگە

## بەڕێوەبردنو نەخشەکێشانی کۆبوونەوەکان

نەخشەکێشانو بەڕێوەبردنی ورد دەبێتە مایەیی بەدیهێنانی کۆبوونەوەی سەرکەوتوو، بەشێوەیەك دووجۆر کۆبوونەوە هەیە، یەکەم کۆبوونەوەی یاسایی ئەم جۆرە لە گردبوونەوە پێشتر نەخشەیی بۆ داڕێژراوەو کاتی دیاریکراوە، وەك گردبوونەوەی ساڵانەی فرۆشراوەکان. دووەم بریتییە لە کۆبوونەوەی نافەرمی ئەمجۆرە لە کۆبوونەوە بە زۆری لە ناو دامەزراوەکەدا دەبەسترێت بە شێوەی ئاسایی، یان لەسەر داوای ئامادەبووان ڕاستەوخۆ.

نەخشەکێشان بۆ کۆبوونەوە: ئامانجی نەخشەکێشان چون یەکە بەدەر لە جۆری کۆبوونەوەکان. لە ڕاستیدا کۆمەڵێك پرسیار هەیە پێویستە ئەو کەسەی بانگهێشتی کۆبوونەوەکە دەکرێت وەڵامیان بداتەوە لەوانە:

مەبەست لەم کۆبوونەوەیە چییە؟

ماوەی کۆبوونەوەکە چەندە؟

کێن ئەوانەی پێویستن لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەبن؟

چین ئەو ئامێرو یاریدەرانەی پێویستن؟

لە کوێ ئامادەبووان کۆدەبنەوە؟

باشترین کاتی کۆبوونەوەکە چ کاتە؟

بۆ دیاریکردنی کاتو شوێنی کۆبوونەوەکە پێویستە بەشداربووان ئاگادار بکرێنەوە بۆ دەستنیشانکردنی کاتێکی گونجاو بۆیان. دەبێت سێ کاتو مێژوویی جیاواز دیاری بکرێت بە لایی کەمەوە داوا لە بەشداربووان بکرێت لەم کاتانەدا دەستبەرداری کاری ڕۆژانەیان بن تا لە کۆتاییدا دوا وەخت بۆ کۆبوونەوەکە دەستنیشان دەکەن، پێویستە چەند جارێك ئەم ڕاییکردنە دوپات بکرێتەوە تا دەگەن بە کاتو مێژوویەکی گونجاو بۆ ڕاییکردنی کۆبوونەوەکان.

بنەماکانی کۆبوونەوە: بنەماکانی هەموو کۆبوونەوەیەك پشت ئەستورە بە ڕێگای کاری دامەزراوەکەو جۆری ڕێککەوتنەکە، ئەگەر کۆبوونەوەکە لەگەڵ کەسێك، یان چەند کەسێکدا بێت. لە ڕاستیدا پێویستە کۆمەڵێك بناغە دابنرێت لە کاتی هێڵکاری هەر کۆبوونەوەیەکدا، لەوانە:

- دابینکردنی بودجە.
- خشتەی کاری کۆبوونەوەکە.
- ئەو کەسانەی بەشدار دەبن لە کۆبوونەوەکەدا.
- میوانەکان، یان ئەوانەی هەڤپەیڤین پێشکەش دەکەن.
- شوێنی کۆبوونەوەکە.
- ئامێرەکانی دەنگو پیشاندان (ڤیدیۆ).
- کاتەکانی پشوو.

ئاگادارکردنەوەی بەشداربووان لە کۆبوونەوەکان: دەکرێت بەشداربووانی کۆبوونەوەکە ئاگادار بکرێنەوە لە ڕێگەی تەلەفۆن، یان پۆستی ئەلکترۆنی، یاخود تۆڕی گەیاندن. پێویستە ڕێکخەری کۆبوونەوەکە لیستێکی پێبێت بە ناووناونیشانی ئەوانەی پێویستە ئاگاداربکرێنەوە، جەخت بکرێتەوە لەسەر کاتو جێگای کۆبونەوەکەو ئەو باسەی، یان باسانەیی لە کۆبوونەوەکەدا دەستاو دەستی پێدەکرێت، ناوی بەشداربووانیان پێ بگوترێت.

پێویستە جەخت بکرێتەوە سەر دابینکردنی تەواوی کورسیو قەڵەمو کاغەز لە ژووری کۆبوونەوەکاندا، دڵنیابوون لەسەر دابینکردنو ئامادەباشی هەموو ئامێرە ئەلکترۆنییەکان کە یارمەتیدەرو تەواوکەری کارەکان.

خشتەی کارکردن: خشتەی کار پێکدێت لە هەموو ئەو باسانەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت، ئەم خشتانە بەگوێرەی گردبوونەوەکان دەگۆڕێت. کەتەلۆگی کاری نایاسایی بریتییە لە لیستێکی ئەو بەندانەی گفتوگۆی لەسەر دەکرێت. بەڵام کاری فەرمی پێکدێت لە ڕووداوو کاتی جیاوازو ئاخێوەرەکانو جێگای ڕووداوەکان.

* پێویستە هەموو قەواڵەکان ئەوانەی پەیوەستن بەو باسانەی لە کۆبوونەوەکانی داهاتوودا گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت لە ڕێکخەر (مصنف)ێکی تایبەت بە ڕێککەوتندا بپارێزرێن، سودمەند دەبێت بۆکۆبوونەوەکانی داهاتوو لە کاتی ئامادەکردنی خشتەی کاردا.

خشتەی کاری نموونەیی گردبوونەوەی بەڕێوبەرەکان پێکدێت لەم بەندانەی خوارەوە:

- خوێندنەوەی کۆبوونەوەکانی ڕابردوو لە لایەن پێشکەشکارەوە.
- پیشاندانی ڕاپۆرتی بەشداربووان لە کۆبوونەوەکەدا.
- پەسەندکردنی هەر بڕیارێك کە دەرئەنجامی کۆبوونەوەکانە.
- گفتۆگۆکردنی کارەکانی ئێستا.

پێویستە لیستی کاری ئێستا هەموو ئەو باسانەی تیادا بێت کە دەستاو دەست دەکرێت، لەگەڵ کۆپییەکی وتارەکەو ڕاپۆرتو بڕیارەکانو ناردنیان بۆ بەشداربووان.

بەرنامەی ئاڕاستەکردنی کۆبوونەوەکان: کۆمپیوتەر ئامێرێکی بەسودە لە نەخشەکێشانی کۆبوونەوەکاندا، لە توانادا هەیە بەرنامەیی

خشتە ئەلکترۆنییەکانو بەڕێوەبردنی پرۆژەکانو بەڕێوەبردنی زانیاری کەسی لە ئامادەکردنی کۆبوونەوەکاندا بەکاربهێنرێتو سودی لێوەربگیرێت. دەتوانرێت بەشێوەیەکی زۆرباش سوود لە بەرنامەی بەڕێوەبردنو لیستی کار وەربگیرێت، بە مەبەستی ئامادەکردنی کۆبوونەوەکان ئەم ئامۆژگارییانە پێشکەش دەکرێت. ئەم جۆرە بەرنامانە تەواوکاری پۆستی ئەلکترۆنیو سالنامەیە. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت پێکبێنین لەسەر خشتەیەکی کاتی بۆ بەشداربووان لەسەر کۆبوونەوەکانو دیاریکردنی شوێنێکی گونجاوو ڕێکخستنی ئامێرەکان، ناردنی تێبینییەکان بە پۆستی ئەلکترۆنیدا. هەندێ لەم بەرنامانە تایبەتمەندن لە چارەسەری ئاریشەکاندا کە دەتوانێت بە کاربەر پێشخۆی بدات بە چەند هەنگاوێک بۆ ئامادەکردنی **microsoft outlok** لە ڕێگەی بەرنامەی کۆبوونەوەکە. سەرباری بەرنامەکانی پێشوو دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ هەمان مەبەست.

ئامرازو پێداویستییەکانی هۆڵی کۆبوونەوەکان: کاتێك مێژووی کۆبوونەوەکان دەستنیشان کرا پێویستە هۆڵێکی گونجاو بۆ گردبوونەوەکە دیاری بکرێت. زۆربەی کۆمپانیاکان هۆڵی کۆبوونەوەیان هەیە گونجاوە لەگەڵ کۆبوونەوەیەکی ناوخۆیی. بەڵام بە مەبەستی کۆبوونەوەی گەورە پێویستە جێگایەك لە دەرەوەی کۆمپانیاکە دەستنیشان بکرێت، نموونەی ئەو هۆڵانەی لە ئوتێلەکان، یان ناوەندە بازرگانییەکاندا هەیە.

لە کاتی دیاریکردنی شوێنی کۆبوونەوەدا پێویستە بەشێوەیەکی باش بیر لەم هۆکارانە بکرێتەوە.

ژمارەی بەشداربووانو مەبەست لە کۆبوونەوەکە چییە؟

- دیاریکردنی بودجە.
- ڕووناکیو ئامێری دەنگ.
- هەوا گۆڕکێ.

تەواوکاری خزمەتگوزارییەکان وەك: (ژەمەکانی خواردن، ئامێری دەنگو ڤیدیۆ). کاتێك هۆڵی کۆبوونەوەکە دیاریکرا پێویستە هۆڵەکە ئامادەبکرێت لە ڕاستیدا گەلەك شێوازی ڕێکخستن هەیە دەکرێت گوڵبژێریان بکەین. لەم بارەشدا پشت ئەستورین بە ژمارەی دانیشتوانو قەبارەی هۆڵەکە بە گوێرەی خۆی.

بەڵام ئەو شێوە باوانەی هۆڵی کۆبوونەوەیان پێ ئامادە دەکرێت ئەمانەن:

* شێوازی شانۆیی: ئەم جۆرە گونجاوە کاتێك ژمارەی بەشداربووان زۆر بێت. ڕێکدەخرێت بۆ پێشکەشکردنی وانەی پێشکەشکاریو پیشاندانی دەنگو ڕەنگ ئاخێوەر بە بەرچاوەوەیە لە جێگایەکی بەرزی سەکۆکەدا.

* شێوازی پۆل: گونجاوە بۆ ئەو کۆبوونەوانەی پێویست دەکات بەشداربوان تێبینییەکانیان تۆمار بکەن، ئەم جۆرە لە بارە بۆ هۆڵی درێژوتەنگ بەشێوەیەك سەرنجی بەشداربووان ڕاستەوخۆ لەسەر ئاخێوەر دەوەستێتەوە.

* شێوازی پیتی **U**: ماوەدەدات قسەکەر بگات بە هەموو بەشداربووانی کۆبوونەوەکە، ئەم شێوازە باشە بۆ ئەو کۆبوونەوانەی قەبارەیان مامناوەندە.

* شێوازی پیتی**T**: ئەم شێوازە لەبارە بۆ کۆبوونەوەی کۆمەڵێکی کەم.

* شێوازی مێزی خڕ: شێوازێکی نافەرمییە کار ئاسانی دەکات لە گفتوگۆکردن لەنێوانی بەشداربووان، هەروەها گونجاوە بۆ گروپی بچووك.

پێویستە تەواوکاری بکرێت لە ناوەڕۆکی لیستی کۆبوونەوەکان لە ڕووی دابینکردنی ئامێری دەنگو وێنەو پەیوەندیکردن لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە، دابینکردنی ڕۆشناییو ساردو گەرمی. دەبێت جەخت بکرێتەوە لە سەر دڵنیایی ئامادەباشی مایکرۆفۆنەکانو کۆمپیوتەرەکانو ئامێرە جیاوازەکانی ڕاگەیاندنو ئامێری ڤیدیۆو شاشەکانی پیشاندان. جەخت بکرێتەوە لەسەر دابینکردنی تەواوی پەڕەی یاداشتو قەڵەمو ئاوی خواردنەوە.

جێبەجێکردنی پەیوەندی ئەلکترۆنی: لە توانادا هەیە سستمی پەیوەندیکردن بەکاربهێنرێت بۆ ڕاییکردنی کۆبوونەوەکان چ فەرمی، یان ناپاسایی بێت، سەرەتا لە ۲ کەسەوە تا ۲٥۰۰۰ کەس بەم ڕێگایە دەتوانرێت ئاگادار بکرێنەوەو پەیامی کۆبوونەوەکەیان بدرێت بە گوێدا. لەگەڵ بەرزبوونەوەی تێچوونی گەشتو پێداویستی زیاتر بۆ دابینکردنی کاتو گواستنەوەی کار بە هەموو ڕووەکانییەوە لە ناوچە گەرییەوە بۆ جیهانگەرایی. پەیوەندییە ئەلکترۆنییەکان جێگای گفتوگۆی سەرپێی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەی گرتووەتەوە کە مەبەست تیایدا ئاخاوتنە لەسەر باسێك. لەگەڵ جیاوازی تەکنیکی پەیوەندیکردندا، بەڵام هاوبەشن لە هەندێك خاڵدا لەوانە:

- بەستنەوەی کەسانی ئامادە لە شوێنە گشتییەکاندا.
- دڵنیابوون لە بە یەگەیشتن، پێکگەیشتنی دوو ئاراستە.
- دڵنیابوون لە پەیوەندی بەهێز.

لەم ڕێگایەوە دەتوانرێت هەموو پەیڤینەکانو ژمارەکانو وێنەکان بنێردرێت بەم ڕێگایانە:

فاکس، بەریدی ئەلکترۆنی، کۆبوونەوەی دەنگو ڕەنگ ڕاستەوخۆ لە نێوان دوو کەسدا بە هۆی ئامێری ڤیدیۆوە تەواو دەکرێت. خزمەتگوزارییەکانی ویب و... هتد.

نووسینەوەی کۆنووسی کۆبوونەوەکان:

کۆنووسی کۆبوونەوەکان تۆمارێکی وردی گرنگترین ڕووداوەکانی ڕێککەوتنەکان پێکدەهێنێت، پێویستە کۆنووسی کۆبوونەوە نافەرمییەکان کورتو سادەبن، بەڵام کۆبوونەوە یاساییەکان دەبێت کۆنووسەکانی زیاتر ئاڵۆزبێت، نووسینەوەی کۆنووسەکان هونەرێکی تایبەتە دەخوازێت بە مەشقکردنێکی بەردەوام تا دەگاتە ئاستی داواکراو. دەکرێت لەم خاڵانە سوود مەند بین:

کۆپییەکی تۆماری کۆبوونەوەکان بەدەست بهێنە، ئەگەر ڕووبەڕووی هەندێ دەستەواژەی تەکنیکی بوویتەوە لە توانادا نەبوو لێیان تێبگەیت، هەوڵ بدە شیان بکەیتەوەو لێیان تێ بگەیت.

تێبنییە ڕەخنەییەکان تۆمار بکە.

* بیر لە بەکارهێنانی تۆمارکەرێکی بچووك بکەرەوە بە ڕەزامەندی گشت بە شداربووان پێش بەکارهێنانی.

بەشێوەیەکی حەرفی گشت بڕیارو ڕاستکردنەوەیەکو فەرمانێکی کۆتایی تۆمار بکە.

ڕەشنووسێکی تەواو دەربارەی کۆنووسی کۆبوونەوەکە بە پەلە تۆمارکە، بیدە بە بەرپرسی کۆبوونەوەکە

کۆنووسی کۆبوونەوەکە بگەیەنە بە دەستی ئەوانەی ئامادەنەبوون.

کۆنووسەکە ڕاستکەرەوە لە کۆبوونەوەی داهاتوودا ئەگەر پێویستی کرد، دەبێت چاککردنەوەکە بە قەڵەمی سور بێت، نابێت کۆنوس جارێکی کە دابڕێژرێتەوە، یاخود لێی لابرێت، ئەگەر ڕاستکردنەوەکان زۆربوون ئەوا لە پەڕەیەکی جیاوازدا بینوسە. لەگەڵ کۆنووسە ئەسڵییەکەدا چەسپی بکە، نیشانەیەك لای برگە چاککراوەکە دابنێ لە کۆنووسە ئەسڵییەکەدا.

لە کاتی دانانی کۆنووسە فەرمییەکەداو لە کۆتایدا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

- ناوی کۆمەڵەکە، شوێنو مێژوو کاتی کۆبوونەوەکە
- لیستێك بە ناوی بەشداربووان.
- پشتڕاستکردنەوەی کۆنووسی ڕابردوو.
- ڕاپۆرتی کارگوزارەکان.
- کارە تەواونەکراوەکانو ئەو هەڤپیڤنانەی تەواو نەکراون.
- ڕاییکردنی کارەنوێیەکانو بەجێهێنانی ئەو شوڵانەی بڕیاری لەسەر دەدرێت.
- مێژوو شوێنی کاری داهاتوو.
- دواخستنی کۆبوونەوەو دیاریکردنی کاتەکەی.
- واژۆی سکرتێرو واژۆی بەرپرسی کۆبوونەوەکە.

پێویستە کۆنووسەکان لەسەر پەڕەی سپی بێت، ناونیشانی بابەتەکە لە ناوەڕاستی لاپەڕەکەدا بێت.

دوایی تەواوبوونی کۆبوونەوەکە کۆمەڵێك کار هەیە دەبێت ڕەچاو بکرێت لەوانە دابەشکردنی کۆنووس بەسەر کارگوزارەکانداو پێداچوونەوەی تێچوونی کۆبوونەوەکەو نووسینی نامەی پێزانینو سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی بەشداربوون لە سەرکەوتنی کۆبوونەوەکە.

و: محەممەد مێرگەیی

# گالیسکە کۆنەکە

لە دارستانێکی سەوزو جوانی پڕ لە دارودرەختی بەرداردا، خانوویەکی دارینی بچکۆلە هەبوو، لەو خانووەدا کۆمەڵێك ئاژەڵ پێکەوە دەژیان، خۆشەویستیو هاوڕێیەتیو ڕێزگرتن پێکەوەی بەستبوونەوە. ئاژەڵەکان: مێشو بۆقو ژیشكو کەڵەشێرێکی پەرزێرین بوو.

ڕۆژێك لە ڕۆژان کە تیشکی خۆر بە دەرەوە بوو، ئاژەڵەکان بۆ کۆکردنەوەی دارو گوڵو قارچك چوونە دەرەوە، تا گەیشتنە جەنگەڵستان، لە ڕێگادا گالیسکەیەکی شێوە سەیر سەرنجی ڕاکێشان، کە لەوێ لە ناوەڕاستی جەنگەڵەکەدا بەجێمابوو، تایە(چەرخە)کانی گالیسکەکە زۆر سەیر بوون، چونکە یەکێکیان گەورەو ئەویتر بچووكو سێیەمیان قەبارە ناوەنجیو چوارەمیان زۆر مەزن بوو، بە گالیسکەکەوە دیار بوو، کە ماوەیەکی زۆرە کەس بەکاری نەهێناوە، چونکە دیتیان لەسەر داری گالیسکەکە جاڵجاڵۆکە تەونی دروست کردووەو هەمووشی شێداربووە.

لەو ساتەداو کاتێك ئەم کۆمەڵە هاوڕێیە بە سەرسوڕمانەوە تەماشای گالیسکەکەیان دەکرد، کەروێشك لە تەنیشت ئەوانەوە دەرکەوتو تەماشایەکی گالیسکەکەی کردو دەستی کردە پێکەنین.

لە کەروێشکیان پرسی: ئەم گالیسکەیە هی تۆیە؟!

ئەویش گوتی: نەخێر ئەمە گالیسکەی ورچە، هەروەك دەیبینن بە تەواوی دروستی نەکردووەو بەمشێوەیە وازی لێ هێناوەو ڕۆیشتووە.

ژیشك گوتی: هاوڕێیان وەرن ئەم گالیسکەیە ببەینەوە ماڵەوە، من دڵنیام بۆ زۆر ئیشوکار بە کەڵکمان دێت و یارمەتیمان دەدات.

هاوەڵەکانیشی لەسەر ڕایەکەی ڕازیبوون. هەموویان دەستیان کردە پاڵنانی گالیسکەکە، بەڵام زۆر قورس بوو، لە جێگەی خۆی نەدەجولایەوە، ئەمە سەرەڕای تایە سەیرو سەمەرەکانی کە زیاتر کارەکەیان سەخت کردبوو، هەوڵیاندا جاری دووەمو سێیەم پاڵی پێوەبنێن، بەڵام هەر بێسوود بوو.

لەولاوەش کەروێشکەکە هەر خەریکی پێکەنین بوو، تەنانەت بە هۆی پێکەنینی زۆرەوە کەوتە سەر زەویو دەیگوت: ئەم گالیسکە پیسە چ سوودێکی دەبێت بۆتان؟!

ئاژەڵە هاوڕێیەکان گوتیان: لەبەرئەوەی ناتوانین گالیسکەکە ببەین.. با هەر یەکەو لە ئێمە، تایەیەك لە تایەکان ببات.. هەموویان ڕازی بوونو تایەکانیان برد..

لەم ساتانەدا کەروێشك بەردەوام بوو لەسەر پێکەنینو گاڵتە

پێکردنیان.

ئاژەڵەکان گەیشتنەوە ماڵەوەو بیریان کردەوە چۆن سوود لەو تایانە وەربگرن.

مێشەکە تایە بچووکەکەی بردو ئامێرێکی ڕستنو چنینی لێ دروستکرد.

بۆقەکە تایەیەکی بەکارهێنا بۆ هەڵکێشانی ئاوی بیرو ئاودانی کێڵگەکانیان.

ژیشک گالیسکەیەکی بچکۆلەی دروستکرد بۆ هەڵگرتنی ئەو مێوەهاتەی لە باخو بێستانەکە کۆیان دەکاتەوە.

کەڵەشێر.. دەستارێکی بۆ هاڕینی گەنمو دروستکردنی کێکو شیرەمەنی بە تامو خۆش کە شارەزایی زۆری لێ هەبوو، دروستکرد.

دوای ماوەیەک کەروێشک هاتە سەردانی هاوڕێیەکان لە ماڵەکەیانداو زۆر سەرسام بوو لەوەی دیتی! ئەوانیش وەک هەر میوانێکی ئازیز بەخێرهاتنیان کرد.

مێش دەستەوانەیەکی خوریو هەروەها بۆق سەبەتەیەک گێزەری، بە دیاریی پێ بەخشی، ژیشک چوو بە گالیسکەکەی میوە بهێنێت.

کەڵەشێریش کۆمەڵێک لەو شیرەمەنیانەی پێ بەخشی کە بە دەستی خۆی دروستی کردبوون.

کەروێشک لە هەڵوێستی پێشووی شەرم دای گرتو لەوەی ئەو ڕۆژە بەرامبەریان کردبووی زۆر پەشیمان بوو، بۆیە بە چوار هاوڕێکەی گوت: من زۆر داوای لێبووردنتان لێ دەکەم کە گاڵتەم پێکردن لەو ڕۆژەی گالیسکەکەتان دۆزییەوە.

ئەوانیش پێیان گوت: گوێی مەدەرێ، دەزانین تۆ دڵت سافەو مەبەستت خراپە نەبوو، وەک هاوڕێیەکی ئازیز بەخێرهاتنت دەکەین.

ئیتر هەموویان پێکەنینو دەستیان کردە قۆناغێکی نوێ لە کارکردن.

سەرچاوە/ گۆڤاری (البراعم) ژمارە (٢).

# بەڵێنی کیسەڵەکان

ڕۆژێکیان هۆزی کیسەڵەکان بڕیاریاندا، بۆ گەشتو سەیران بچنە دەرەوە. لەبەرئەوەی سروشتی کیسەڵەکان بەو جۆرەیە کە بە هێواشی کاردەکەنو دەجووڵێن.. حەوت دانە ساڵیان پێچوو، تا بۆ گەشتو سەیرانەکەیان ئامادە بوون!!!

لە کۆتاییدا هۆزی کیسەڵەکان، بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی لە بارو شیاو، ماڵیان بە جێ هێشت. سەرەنجام لە دووەم ساڵی گەڕانەکەیاندا، شوێنێکیان بۆ گەشتوسەیرانەکەیان پەیدا کرد. بۆ ماوەی شەش مانگ، شوێنەکەیان خاوێن کردەوە. پاشان سەبەتەی سەیرانەکەیان هێناو کەرەسەی سازکردنی خۆراکیان ساز کرد.. دواتر زانییان، خوێیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێناوە.

هەموو لایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون.. کە گەشتو سەیران، بێ خوێ. بێتامەو هیچ چێژێکی نییە.

پاش تاووتوێکردنو وتووێژێکی زۆر.. کەمتەمەنترینو گەنجترینو بەگورترین کیسەڵیان بۆ خوێ هێنان، هەڵبژارد.

کیسەڵی کەمتەمەنو بچکۆلە، بەرامبەر ئەم هەڵبژاردنە دەیبۆڵاندو دەیناڵاند.. لە ناو قاپورەکەیدا بەلەقاژەی دەکردو دەیبرتاند.

گەرچی ئەو کیسەڵە خێراترینو بەگورترین کیسەڵی ناو هۆزی کیسەڵەکان بوو. بەڵام بە مەرجێک ڕازی بوو، بڕوات. مەرجەکەش ئەوە بوو: تا ئەو نەگەڕێتەوە.. هیچ کەس دەم بۆ نانو خواردنەکەیان نەبات.

هۆزی کیسەڵەکان مەرجی کیسەڵە گەنجو بەگورەکەیان پەسەند کردو ئەویش بە ڕێ کەوت..

سێ ساڵ تێپەڕی، کیسەڵە گەنجەکە نەگەڕایەوە. بوو بە پێنج ساڵ. بوو بە شەش ساڵیش هەر نەهاتەوە.. پاشان لە حەوتەم ساڵی دیارنەمانو نەهاتنەوەیدا، پیرترین کیسەڵ نەیتوانی بەرگەی برسێتی بگرێتو درێژە بە برسێتیو چاوەڕوانی بدات.. بۆیە گوتی: دەمەوێت خواردنێک بخۆم. دەستی بە پێچانەوەی بابۆڵەیەک کرد.

لەم کاتەداو لە پڕێکدا کیسەڵە بەگورەکە کردی بە هاتو هاوارو لە پشت درەختێکەوە دەربەڕیو بە سەرسورمانێکەوە گوتی:

دەبینن.. من دەمزانی ئێوە لە ڕێی من ناوەستن.. بۆیە هێشتا نەڕۆیشتووم، خوێتان بۆ بهێنم!!!!!

هەندێک کەسیش لە ئێمەو ئێوە مانان، ژینمان لە چاوەڕوانیی کەسانێکدا بەسەر دەبەین. کە وایان لێ ڕادەبینین، ئەو بەڵێنانەی بە ئێمەیان داوە بیبەنەسەرو کارێکیان بۆ بکەن. ئەوەندەی دڵپەشێوو شێرزەو چاو لە دەستی ئەنجامدانی کارەکانین لە لایەن کەسانی دیکەوە. خۆمان هیچ کارێک ئەنجام نادەینو گورێک بە خۆمان نادەین. کەواتە بۆ ئەنجامدانی کارەکانت پشت بە خۆت ببەستەو چاوەڕوانی کەسانی دی مەکە.

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

بەشی دووەم و کۆتایی

# خراپترین

# هەشت هەڵەی ئابووری لە مێژوودا

**پێنجەم: فرۆشتنی DOS**

لە ساڵی (١٩٨٠ تیم باتیرسون) کە بەرنامەداڕێژەری کۆمپانیای (سیاتیل)ی بەرهەمەکانی کۆمپیوتەربووە. تاکو گەیشتووە بە سیستەمی کارپێکردنی DOS لە هەمان کاتدا (بیل جیتس) خەریکی بەرنامەکانی کارپێکردن بووە کە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت دەیتوانی بیفرۆشێتو بوار بدات بە کۆمپانیای (ئای- بی- ئێم) بە کاری بهێنێت. ئەوە بوو (بیل جیتس) هەستا بە کڕینی سیستەمی کارپێکردن بەرامبەر (٥٠) هەزار دۆلار- لە کۆمپانیای سیاتیل کاتێک کۆمپانیای سیاتیل هەستی بەو هەڵەیە کرد کە کردوویەتی ئەو هەڵەی لە دەست داوە کە بە تەنها خاوەنی سیستەمی کارپێکردن بووە، ئەوەش بە هۆی سورنەبوونییەوە، کۆمپانیای مایکرۆسۆفتی بە فێڵو هەڵخەڵەتاندن تۆمەتبارکرد کە (ئای- بی- ئێم)ی باس نەکردووە کە ئەو سیستەمی کارپێ کردنەکە دەکرێت ئەوە بوو فرۆشتنی سیستەمی کارپێکردنو خاوەندارێتی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بۆ ئەم سیستەمە بووە هۆی ئەوەی کۆمپانیاکە زاڵ بێت لە جیهانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر، چونکە بەهای ئەم بەرنامە لەو ئانو ساتەدا گەیشتووەتە (٢٥٣) ملیار دۆلار ئەوەش بەهای ئەو زیانەیە کە کۆمپانیای سیاتیل بۆ بەرهەمەکانی کۆمپیوتەر لێی کەوتووە ئەگەر پارێزگاری لەو سیستەمی کارپێ کردنە (DOS) بکردبایەو بە هەرزانی نەیفرۆشتبایە.

**شەشەم: فرۆشتنی لویزیانا**

لە ساڵی (١٨٠٣) ناپلیۆن خەباتی دەکرد بەرگری لەو خاکانە بکات کە فەرەنسا لەجیهانی نوێ دەستی بەسەردا گرتبوون. بە تایبەتی هایتی. چونکە سوپاکەی ناپلیۆن ئارەزوومەندی وازهێنان لە هایتی نەبوو هەستا بە فرۆشتنی هەرێمی لویزیانا لە جیاتی بەندەری نیوئۆرلاینز بە تەنها هەروەکو پێشتر باسکرا لەپاشان بەرامبەر (١٥) ملیۆن دۆلار فرۆشرا. دامەزراوەی (کاشمان ئاندویکفیلد) کە دامەزراوەیەکی بیناسازی بازرگانی جیهانییە دەڵێت: نرخی ئێستای ئەم ناوچەیە کە ١٥ویلایەتی ئەمریکیو دووکەرتی کەنەدی لە خۆدەگرێت، دەگاتە نزیکەی (٧٥٠) ملیار دۆلار. ئەوەش نرخی ئەو زیانەیە کە فەرەنسالێی کەوتووە لە ئەنجامی فرۆشتنی ئەو ناوچەیە لەو کاتەدا.

**حەوتەم: فرۆشتنی دوورگەی مانهاتن**

لە سەودایەکدا کە نیشانەی کورتبینی بووە دانیشتوانی بنەڕەتی لە ساڵی(١٣٦٢) هەستاون بە فرۆشتنی دوورگەی مانهاتن بەرامبەر هەندێ زێڕو ئاڵتون، زۆرێك لە

دانیشتوانی نیۆرك پێیان وایە كە دوورگەی مانهاتن (چەقــی گەردوونە) ئەوەی نرخی ئــەو زیانە دادەنێت كە لە فرۆشــتنی ئەم دوورگەیــە كەوتووەتــەوە دەڵێــن: نرخی ئێســتای دوورگەكە یــەك تریلیۆن دۆلارە بە گوێــرەی خەملاندنەكانی دامەزراوەی (كاشــمان ئاندویكفیلــد)ی بازرگانــی نێودەوڵەتــی. هەروەهــا لە ســەودایەكی تــردا كە ئەویــش نیشــانەی كورتبینییە هۆڵەندییــەكان دوای ئــەوە هەســتان بە فرۆشــتنی نیوامســتردام بە بەریتانیا لە بەرامبــەر دەســكەوتنی ناوچەیــەك كــە ئێســتا ناســراوە بە كۆماری ســورینام كە وڵاتێكــی بچووكە لە ئەمریــكای لاتینیو تێكــڕای بەرهەمی ناوخۆیــی دەگاتە(٢،٩) ملیاردۆلار.

هەشــتەم: قەیرانــی دارایــی جیهانی

ســەرۆكی یەدەگی فیدڕاڵــی ئەمریكی بــن بیرنانكیو هاوتاكانی لە سەرانســەری جیهان دەتوانن جارێكی تر ئابوری جیهانی ببوژێننەوە، یاخود شێواز گەلێك بەكاربێنن كە بێتە هۆی ئەوەی سەركەوتن نەیەتەدی. ڕۆبــەرت مۆندیل كــە خەلاتی (نۆبڵ)ی لە بواری ئابوری بۆ ســاڵی (١٩٩٩) بە دەســت هێناوە دەڵێت: سیاســەتی مەزەندەكردنی هەڵە لە ماوەی سالانی بیستەكانو سییەكان بووەتە هۆی دابەزینی گشتی لەئاستەكانی بەهــای شــمەكو خزمەتگوزارییــەكان كە بووەتــە هۆی شــێواندنی ســەقامگیری لە جیهانــدا. هەروەهــا گوتــی: ئەگەر نرخی ئاڵتــوون لــە كۆتــا ســالانی بیســتەكان بەرزبكرابایەوە، یاخود بانكە ناوەندییەكان سیاسەتێكی ســەقامگیربوونی نرخەكانیان پەیــرەو بكردبایە لە جیاتــی پابەندبوون بەپێــوەری ئاڵتــوون ئەو ســاكە دەرفەت نەدەبوو بۆ ڕوودانی ئەودارمانە مەزنەیان شۆڕشی نازییەكان، یاخود تەنانەت جەنگی دووەمی جیهانیش.

گۆڤارەكــە نوســیویەتی ئــەم دەستپێشــخەرییە تونــدی پێــوە دیــارەو با ئێمــەش هیواخوازبین كــە بیرنانكیو هەڤاڵانــی لەو كەســانە دەبن كــە دەبنە هۆی زیــان كەوتنەوەیەكی ئەوتۆ كە هیچ ئامێرێكی كۆمپیوتەر لــە توانایدا نەبێت بیژمێرێت.

بەشی دووەم و كۆتایی

ئا: جەلال جەباری

# زانیاری ئابووری

* (فراتیــس ئەفرەنجییە): ئەو دراوە بوو كە خاچپەرستەكان كاریان پێ دەكرد لە كاتی داگیركردنی شامدا.

* بــۆ یەكەمجــار لــە مێــژوودا (موحەممەد عەلی پاشا) والی میسر باجی (تێچوونی شمەك)ی پێویست كرد.

* (ئەسغناتســیا) دراوێكــی كاغــەزی ڕووســییە بــۆ یەكەمجار لە ســاڵی (١٧٦٩) زاینی دروستكرا.

* یەكەم ئامێری ئابووری لە حكومەتی سۆڤیەت ساڵی (١٩١٧)ی زاینی دروستكرا.

* (هەڵئاوســان) بریتییــە لــە بەرزبوونەوەی بەردەوام لە ئاســت نرخی گشتیو هاتنە خوارەوەی دراوی كڕیار.

* ساڵی (١٩٧١)ی زاینی لە سەر دەستی ســەرۆكی ئەمەریكای ئەو كاتە (نیكســۆن) بە شــێوەیەكی یەكجــاری كۆتایی هات لە گۆڕینی دۆلار بۆ ئاڵتون.

* (ئەسكێدۆ) یەكەی دراوی پورتوگالو شیلییە، هەر (ئەســكێدۆ)یەكیش یەكسانە بە (١٠٠٠) پیزۆ.

* (فارســینگ) بچووكتریــن یەكــەی دراوی ئینگلیزییە.

* (دۆنــگ) یەكــەی دراوە لە ڤێتنامی باشوور، هەر (دۆنگ)ێك دەكاتە (١٠٠) ساو.

* (ڕانــد) یەكــەی دراوە لە ئەفریقای باشــوور، هەر (ڕاند)ێك یەكسانە بە (١٠٠٩) سەنت.

* بــازاڕی دراوی ئەورووپی لە ســاڵی (١٩٥٨) زاینــی لــە لایــەن چــوار وڵاتــی ئەورووپییەوە دامەزرا.

* (ســیدی) یەكەی دراوە لە گانا، هەر (سیدی)یەكیش یەكسانە بە (١٠٠) پساوس.

* ژووری بازرگانــی نێودەوڵەتــی لە ســاڵی (١٩١٩) زاینــی لە لایــەن ( بەلجیكاو فەرەنســاو ئیتاڵیــاو ئەمەریــكا) لــە (ئەتلەنتیك) دامەزرا.

* (فریدمــان) ئابــووری ناســێكی ئەمریكییــە لــە ســاڵی (١٩١٢)ی زاینی لە دایكبووە، لایەنگری ڤوتابخانەی مارشــاڵە لە ئابووری هەندەكیدا.

* (فشــزنت دی تۆرنــی) زانایەكــی ئابووریناســەو یەكــەم كــەس بــوو كــە بیرۆكــەی (بیرۆكراســی) بەكارهێناوە، لە نێــوان ســاڵەكانی (١٧١٢ بــۆ ١٧٥٦) زاینــی ژیاوە.

* (ڤۆن هۆرنیك) نووسەرێكی ئابووری ئەڵمانی بە ناوبانگە، لە نێوان ســاڵەكانی (١٦٣٨ بۆ ١٧١٢) ژیاوە.

ســەرچاوە/ ئینتەرنێــت ماڵپــەڕی (www.3rbsc.com)/ بانكــی زانیاری لە ( ٨٥٠٠ ) پرسیارو وەڵامدا.

هاژە شێروانی

بەشی یەکەم

# لێدوانەکانی کۆتلر لە بازاڕسازیدا

## دروستکردنی کاری بازرگانی قازانجدار لە ڕێگای بازاڕسازی جیهانی

سێ جۆر کۆمپانیا هەیە: ئەوەی کە وادەکات شت ڕووبدات، ئەوەی کە سەیری ڕووداوەکان دەکات، ئەوەشی کە سەری سووڕدەمینێت لەوەی کە ڕوودەدات.

لەبەرئەوەی کە جیهان کەوتووەتە ناو هەزارەی سێیەم، هەر بۆیە هەریەك لە هاوڵاتیانو پیاوانی کار پرسیار لەوەی داهاتوو دەکەن. کەواتە تەنها گۆڕانکاری نییە، بەڵکو ئاستی ڕوودانی ئەم گۆڕانکارییە پلە بە پلەیە، هەروەك کچێکی تەمەن سیانزە ساڵان لەبارەی خوشکە تەمەن نۆ ساڵییەکەی وتی: ئەو لە نەوەیەکی جیاوازە! چونکە خوشکە بچووکەکەی گوێ لە مۆسیقایەکی جیاوازدەگرێتو یاری ڤیدیۆیی جیاوازی هەیەو هەندێك لە هونەرمەندی سینەماییو پاڵەوانی جیاوازی هەیەو دەیانناسێت.

زۆرێك لە کۆمپانیاکانیش هەرەس دەهێنن لە زانینی ئەوەی کە بازاڕەکەی هەر پێنج ساڵ جارێك دەگۆڕێت، هەروەك لە پەرتووکی (کۆچکردنی بەها Value Migration) پشتڕاستی ئەوەی کردووەتەوە کە چۆن داواکارییەکانی کڕیار گۆڕانکاری بەسەرداهات، هەروەها هێزی ڕکابەریش بە ڕێگایەکی بنەڕەتیدا ڕۆیشتو هەر چەند ساڵ جارێك تایبەت بە پیشەسازییەکانی وەك ئاسن هۆیەکانی گەیاندنو چاودێری تەندروستیو ڕابواردن، لەوانەشە کە ستراتیژییەتی قازانجداری دوێنێ ستراتیژییەتی هەرەس هێنراوی ئەمڕۆ بێت.

هەروەکو دەڵێن: کە دوو جۆر کۆمپانیا هەیە ئەوەی کە دەگۆڕێتو ئەوەی کە ون دەبێت، دوو هێزی گەورە هەیە کە دەستنیشانی نەخشەی ئابووری ئەمڕۆ دەکات، ئەوانیش تەکنەلۆژیاو جیهانگەرایین. سیمای تەکنەلۆژی ئەمڕۆش پڕیەتی لە بەرهەمی نوێ کە سەرۆکی ئەمریکی جۆن کەنەدی نەیبینی لە سەرەتایی ساڵانی شەستەکان وەکو مانگی دەستکردو ئامێری ڤیدیۆییو کامێرای تۆمارکەرو ئامێری کۆپیو فاکسو ئامێری تۆمارکردنی پەیوەندی تەلەفۆنیو کاتژمێری ژمارەییو پۆستەی ئەلیکترۆنیو تەلەفۆنی مۆبایلو ئامێری کۆمپیوتەرو لاپتۆپ. تا وای لێهات کە تەکنەلۆژیا ژێرخانی ماددی لقداری کۆمەڵگا پێکبهێنێت، هەر ئەوەندەش نا بەڵکو شێوازەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، هەروەك کە (مارشال مالکوهان) تێبینی ئەوەی کرد کە «هۆیەکانی گەیاندن بریتییە لە پەیام».

یەکێك لە هێزە تەکنەلۆژییە شۆڕشگێڕەکان بریتییە لە ژمارەیی (رقمی) کە زانیاری لە ڕێگایەوە وەردەگێڕدرێتە سەر «شرائح»و یا ڕوونتر بۆ کۆمەڵێك سفرو یەك، کە شرائح لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوە دەنێرێتو وەردەگێڕدرێتە سەر هێمای مۆسیقیو کاسێتی ڤیدیۆیی، لە دواییدا لە ڕێگای تەلەفۆن دەنێردرێتو بە خێراییەك کە باوەڕناکرێت!

هەربۆیە نیکۆلاس نیگرۆپۆنتی کە سەرۆکی کارگەی هۆیەکانی گەیاندنی بەناوبانگو سەر بە پەیمانگەی ماساتشوسیتس بۆ تەکنەلۆژیایە وایدەبینێت کە شرائح شوێنی گەردیلەی گرتەوە، کۆمپانیاکانی پڕۆگرامی کۆمپیوتەری لەمەودوا پێویستی بە بەرهەمهێنانی کۆمەڵێك بەرهەم نابێت وەکو (CD)و دانانو بارکردنو ناردنی بۆ هەموو وڵاتانی جیهان کە وادەکات بەکارهێنەر بە دەنگییەوە بچێتو بیکڕێت، هەموو ئەمانە دەتوانرێت لە ڕێگای ناردنی پڕۆگرامەکە بێت بە ئینتەرنێت تاوەکو دابەزێندرێتە سەر کۆمپیوتەری کڕیار.

هەرچی سەبارەت بە هێزی تەکنەلۆژی دووەمە کە پێشەوایەتی دەکات بریتییە لە جیهانگەرایی، کە ئەمەش لە لای مالکوهانو سەبارەت بە دێی جیهانی کە وێنای کردبوو ئەمرۆ بوو بە ڕاست، ئەگەر هاتوو بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکار لە بانکۆك حەزی کرد کە ئەم پەرتووکە بکڕێت ئەوا دەتوانێت داوای بکات لە ڕێگای سایتی www.amazon.com کە لە سەر تەختە کلیلەکانی کۆمپیوتەرەکەی ژمارەی کارتی (ائتمان)یەکەی دەنێرێتو لە ماوەی چەند ڕۆژێك بە سوپاسەوە پەرتووکەکەی بە دەست دەگات لە ڕێگای پۆستەی خێرای فیدرال ئێکسپرێس. هەروەك فرۆشیاری گوڵ (جا چ بە دانە یا بە کۆ) بێت لە شاری کۆڵنی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە گوڵی سووری دەوێت ئەوا داوای بکاتو باری یەك فرۆکە لە گوڵی سوور لە تەل ئەبیب وەربگرێت.

لە پاڵ تەکنەلۆژیاو جیهانگەرایی هێزی تر هەن کە کاریگەرییان هەیە لەسەر دووبارە ڕێکخستنەوەی ئابووری، سیاسەتی دانانی نرخەکانو ئابوورییەکانو ڕووداوی زیاتر لە ئابوورییەکانی جیهان، هەربۆیە ئەمە وایکرد کە کۆمپانیاکان پارێزراوبن (بەزۆری) لە قۆرخکردنیو ڕووبەڕووبوونەوەی ڕکابەرە نوێیەکان. هەر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆمپانیاکانی تەلەفۆنی بە تێپەڕاندنی کیشوەرەکان وەکو کۆمپانیای AT & T کە بە ئاسانی بچێتە ناو بازاڕی ناوخۆیی، هەروەك کۆمپانیاکانی تەلەفۆنی Bell کە مافی چوونە ناو بازاڕی پەیوەندییەکانی هەیە بۆ ماوە دوورەکان، هەروەك لە ئێستادا کە کۆمپانیاکانی ئامێری کارەبایی دەتوانن کە فرۆشتنو بارکردنی ئامێریان ئەنجام بدەن بۆ بازاڕی جیهانیو کۆمەڵگاکانی تر.

بێجگە لەمانە هێزێکی گەورەی تر هەیە کە ئەویش بریتییە لە تایبەتمەندیی، کە بە گوێرەی ئەو دەتوانرێت کە کۆمپانیاکانو ئاژانسەکان کە کەرتی گشتی خاوەنییەتی بیگۆڕێتە سەر کەرتی تایبەتی، بە باوەڕی ئەوەی کە بە شێوەیەکی باشترو بە توانستی زیاتر بەڕێوە دەبرێت. ئەمەش ئەو کاتە ڕوویدا کە هێڵی بەریتانیو کۆمپانیای گەیاندنی بەریتانی بە تایبەتمەندی کرا. هەر بۆیە ئەمرۆ زۆرێك لە کاڵاو خزمەتەکان پەیماننامەیان لە سەر مۆردەکرێت لەگەڵ کۆمپانیا تایبەتەکان کە لە ناویاندا دامەزراندنو بەڕێوەبردنی گرتووخانەو خوێندنگاکانو هاوشێوەیان دەگرێتەوە.

هەروەك (یوجی بیرا) گۆڕانکارییە ئابوورییەکان پوخت دەکاتەوە بە وتەکانی «داهاتوو وەکو خۆی نەمایەوە» ئەمەو جگە لەوەی کە دەیخاتە سەرو دەڵێت: (ئایا هەست دەکەیت کە کۆمپانیاکەت ڕاونراوە بە گیانلەبەری درندە، ئەگەر وا نەبوو ئەوا دەبێت تۆ ڕاوکەر بیت). چونکە بازاڕەکان ڕەحم ناکەن، هەروەك (جاك ویلش)ی سەرۆکی کۆمپانیای جەنەڕاڵ ئەلیکتریك کە کۆبوونەوەکانی لەگەڵ کارگێڕی کۆمپانیاکەی بەم دروشمە «بگۆڕێ یا بوەستە» دەست پێدەکات. ڕیچارد لف لە کۆمپانیای هیولیت باکارد تێبینی ئەوە دەکات کە «هەنگاوی گۆڕان خێرایە تا ئاستێك کە توانای گۆڕانی کردووەتە ناسینەوەیەکی ڕکابەری»، هەروەك تواناداری لە سەر گۆڕان پێویستی بە توانادارییە لەسەر فێربوون.

هەروەك (پیتەر سینجە)و کەسانی تر بانگەشەی (دامەزراوی فێرکاری)یان کرد هەر بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە کۆمپانیاکانی وەك کۆکاکۆلاو جەنەڕاڵ ئەلیکتریكو ئەسکاندیا کە هەوڵ بدەن بە دامەزراندنی جێگری بەڕێوەبەرانیان لە خاوەن زانین، یا زانست، یان سەرمایەی فیکری. کاری ئەم جێگرانەیە کە سیستەمێك دیزاین بکەن بۆ کارگێڕی زانین تاوەکو کۆمپانیاکان بکەنە فێرکاریو بە خێرایی لە ئاڕاستە بەربڵاوەکانیانو ئەو چاکسازیانەی کە کاریگەری دەکاتە سەر کڕیارو ڕکابەرو دابەشکارو دابینکاران.

لەگەڵ خێرابوونی هەنگاوەکانی گۆڕان کۆمپانیاکان ناتوانن کە پشت ببەستن بە ئەنجامدانی کارە بازرگانییەکانی پێشووترو لەسەر ئەم بارە بمێننەوە تا گەشە بکەن، هەروەك ئەم خشتەیە جیاوازیی نێوان کارەکانمان بۆ دەکات لە نێوان ئەوەی لە ڕابردوو و ئەوەی کە ئێستا ئەنجامدەدرێت بەم شێوەیە:

کارە بازرگانییەکان لە قۆناغی گۆڕاندا

| جاران | ئێستا |
|---|---|
| ئەنجامدانی هەموو کارێك لە ناو کۆمپانیا | کڕینی شتگەلێك لە دەرەوەی کۆمپانیا (ڕێککەوتننامەی دەرەکی) |
| چاکسازی بۆ کۆششی تاکە کەس | چاکسازی لە ڕێگای تێبینی سەرکەوتنی کەسانی ترو پراکتیزەکردنی |
| پشتبەستن بە تواناکانی تاك | پەیوەندی تۆڕدار لەگەڵ کارگەکانی تر، هاریکاری لەگەڵ کەسانی تر. |
| کارکردن لەگەڵ کارگێڕییە تایبەتمەندەکان بە گوێرەی ئەرك | بەڕێوەبردنی پرۆسەکانی کۆمپانیا لە ڕێگای گرووپی کاری جیاواز لە پسپۆڕییەکان |
| وردبوونەوە لە ناوخۆ | وردبونەوە لە جیهانی ناوخۆ |
| وردبوونەوە لە بەرهەم | وردبونەوە لە بازاڕو کڕیار |
| دروستکردنی بەرهەمێك بە سیفاتی گشتی | دروستکردنی بەرهەمێك بە گوێرەی داواکاری کڕیار |
| ئەنجامدانی بازاڕسازی گشتی | ئەنجامدانی بازاڕسازی کە چینێکی کڕیاری دیاریکراو بە ئامانج دەکات |
| دۆزینەوەی ناسینەوەیەکی ڕکابەری کە دەتوانرێت پارێزگاری لەسەر بکرێت | بەردەوامبوون لەسەر دۆزینەوەی ناسینەوەی ڕکابەری نوێ |
| دروستکردنی بەرهەمی نوێ بە هێواشی بە وردی | خێرایی لە سوڕی پرۆسەکانی پەرەپێدانی بەرهەمە نوێیەکان |
| مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵێك دابینکار | مامەڵەکردن لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە دابینکار |
| بەڕێوەبردن لە سەرەوە | ئەدا لە سەرەوەو خوارەوەو باری ئاسۆیی |
| کارکردن لە ناوبازاڕ | دیسان کار کردن لە ناوبازاڕ |

# داهێنان.. ڕێگەت بەرەو سەرکردایەتی دوارۆژ

و/پشتیوان کەریم

بەشی یەکەم

پێش ئەوەی دەست پێ بکەین:

داهێنان چییە؟ مەبەست لە داهێنان چییە؟

لە ڕاستیدا داهێنان چەند پێناسەیەکی هەیە.. بۆیە هەندێك لە پێناسەکانی باس دەکەین. ئاسانترین پێناسەش ئەم پێناسەیە: "چالاکییەکە دەبێتە هۆی هێنانە کایەی بیرۆکە نوێیەکان، لە کاتی جێبەجێکردنداو لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە بەسوودو پەسەندە".

پێناسەیەکی گشتگیری (دکتۆر عەلی حەمادیش) هەیە، کە لە یەکەمین کتێبیدا لە زنجیرەی داهێناندا هاتووە.. ئەویش ئەم پێناسەیەی خوارەوەیە:

"تێکەڵەیەکە لە ئەندێشەی زانستی نەرمو گونجاو، بۆ گەشەپێدانی بیرۆکەیەکی کۆن، یان دۆزینەوەی بیرۆکەیەکی نوێ.. هەرچەندە بیرۆکەکەش بچووك بێت، ئەنجامێکی جیاوازی لێ بەرهەم دێت، کە پێشتر نەبووەو دەشتوانرێت جێبە جێ بکرێتو بە کار بهێنرێت". بە بڕوای من ئەمە پێناسەیەکی گشتگیرە.

کەواتە داهێنان بەرهەمی بیرگەلێکی نوێیە لە دەرەوەی دابو نەریت، یان بیروڕای باودا.. بە مەرجێك بە سوود بن. هەندێجار داهێنان لە بوارێکدا دەبێت.. کە مایەی وێرانکاریو زیانە.. ئەمەش بە داهێنان ناو نانرێت.. بەڵکو بە تێکدان ناو دەبرێت. ئەگەر گوتیان کارمەندێك بۆ کەمکردنەوەی بڕی تێچوون، یان بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەم، یاخود بۆ بەرهەمێکی نوێ.. ئەوا ئەم بیرۆکەیە بە داهێنان دادەنرێت. دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ کتێبی "شرارة الإبداع"ی دکتۆر عەلی حەمادی، کە پێناسەیەکی هەمەلایەنە بۆ داهێنانو چەندین تێگەیشتنی تێروتەسەل بۆ داهێنان دەدۆزێتەوە.. ئەم بابەتەش پێناسەیەکی زۆر کورتی داهێنانەو نامەوێت زۆر درێژی بکەمەوە.

داهێنەر کێیە؟

هەندێك کەس وا دەزانن.. مرۆڤی داهێنەر، هەر بە داهێنەریی لە دایك دەبێت. ئەمەش تێگەیشتنێکی نادروستە. بە کورتی دەڵێم: هەموو کەسێك دەتوانێت داهێنان بکات، یان بیرۆکەی نوێ بدۆزێتەوە.. هەڵبەتە جگە لەو کەسانەی گوێی پێ نادەنو ڕەتی دەکەنەوە!

بازرگانێك.. لە فڕۆکەخانەیەکدا، لە ڕیزێکی دوورودرێژدا وەستابوو. سەرنجی پیاوێکی دا، بینی.. زەرفی سپی بەڵگەنامەکانی گەشتکردنی بەتاڵە.. بیری لە چاپکردن چەند ئاگادارییەك لەسەر ئەم زەرفە سپییانە کردەوە.. پاشان دابەشکردنیان بە خۆڕایی لە کۆمپانیاکانی گەشتە ئاسمانییەکاندا. ئەو کۆمپانیایانە بەم پێشنیازە قایل بوون. بازرگانەکەش بە هاوکاری بەڕێوەبەری چاپخانەیەك، کارەکەی پێکهێناو پرۆژەکەی سەری گرت. ئەنجامەکەشی قازانجی ملیۆنان دۆلاری لێکەوتەوە.

بیرۆکەکە داهێنەرانەو بچووکبوو.. بەڵام نوێ بوو. هەروەها پێشتریش کەس بیری لێ نەکردبووەوە.. بە جۆرێك وای لێهات ئەم کابرایە.. لە ڕێی کۆمپانیاکانی ئەمریکاوە، کڕیارێکی زۆری بۆ پەیدا ببێت.

داهێنانی تاکەکەسی:

لەم بەشەدا تایبەتمەندییەکانی کەسی داهێنەر.. کۆسپو تەگەرەکانی بەردەم داهێنان، لای تاکەکان.. ڕێگەو شێوازەکان بۆ زۆرتر داهێنەر بوون.. ڕێگەکانی دروستکردنی بیرۆکەکانو دواتریش هەندێك نموونەو ئەو بوارانەی تاك دەتوانێت داهێنانی تێدا بکات، دەخەینە ڕوو.

تایبەتمەندییەکانی داهێنەران

ئەمانەی خوارەوە، هەندێك تایبەتمەندی داهێنەرانن.. کە دەتوانیت خۆت لەسەریان ڕابهێنیت:

١- هەرگیز بە یەك چارەسەرو یەك ڕێگە ڕازی نابنو بە دوای ڕێگەو چارەسەری دیکەدا دەگەڕێن.

٢- بەرنامەسازیو خواستو ویستێکی بەهێزیان هەیە.

٣- چەند ئامانجێکی ڕوونیان هەیەو هەوڵی دەسکەوتنو بە یەکگەیشتنی دەدەن.

٤- گوێ بە تەوسو تەشەرو قسەو قسەلۆکە خراپو ڕوخێنەرەکانی کەسانی دیکە نادەن.

٥- ترسیان لە شكست نییە.
٦- حەز لە ڕۆتین ناكەن.
٧- هەردەم دەسپێشخەرو ڕچەشكێنن.
٨- گەشبینو دڵ پڕ لە هیوان.

وانەزانیت گەر ئەم تایبەتمەندییانەت تێدا نەبوو، داهێنەر نیت.. بەڵكو دەتوانیت ئەو تایبەتمەندییانە بە هەند وەربگریتو بیانكەیتە بناغەیەكی چەسپاو لە خۆتدا.

كۆسپەكانی داهێنان:

كۆسپەكانی داهێنان زۆرن.. هەندێكیان لە دەروونی خودی مرۆڤەكەدایە.. هەندێكی دیكەشیان لە لایەن كەسانی دیكەوەیە.. بۆیە پێویستە ئاگات لەو كۆسپانە بێتو بەپێی توانا خۆتیان لێ دوور بخەیتەوە. چونكە داهێنان دەگوژێنێتو تێكو پێكی دەدات. لەو كۆسپانەش:

١- خۆ بەكەمزانین... ئەمەش لە قسەو گوفتاری هەندێك كەسدا خۆی دەنوێنێت. وەك: من لاوازم.. من داهێنەر نیم...
٢- بڕواو متمانە بە خۆنەبوون.
٣- فێرنەبوونو بەردەوام نەبوون لە بەدەستهێنانی زانستی زۆرتردا.
٤- ترسان لە قسەو قسەڵۆكە خراپەكانی خەڵكی.
٥- ترسو سامو شەرمو ڕوونەهاتن لە سەرۆكەكان.
٦- ترس لە نانبڕین.
٧- ترسان لە شكستهێنان.
٨- پاڵدانەوەو ڕازیبوون بەو زەمینەیەی لە ئارادایە.
٩- چەقبەستن لەسەر بەرنامەو یاساو ڕێوشوێنەكان.
١٠- ڕەشبینیو بێهیوایی.
١١- پشتبەستن بە خەڵكانی دیكەو پاشكۆیەتیو شوێنكەوتنیان.

چەند ڕێگەو شێوازێك بۆ داهێنەر بوون

١- بەیانیان زوو، وەرزشی پیاسەو گەڕان بكەو لە دەوروبەریشت ڕابمێنە.
٢- بەیانیانو ئێوارانی هەموو ڕۆژێك، پێنج خولەك بۆ خەیاڵكردن تەرخان بكە.
٣- ئەو بیرۆكەیەی بە چاكی دەزانیت، بەر لەوەی تاقی بكەیتەوە..لەگەڵ كەسێكی دیكەدا، تاووتوێی بكە.
٤- وا بێنە پێش چاوت.. بۆ ماوەی ڕۆژێك، سەرۆكی ئەنجومەنی كارگێڕییت.
٥- لە خستنەڕووی زانیارییەكاندا، لەبری نووسین، وێنەو شێوە ڕوونكارییەكان بەكاربهێنە.
٦- پێش ئەوەی بڕیار بدەیت، لیستێكی تایبەت بە ڕێگە چارەكان، ئامادە بكە.
٧- شتەكان تاقی بكەرەوەو لە بێژنگیان بدەو تاقیكردنەوەشیان هەڵبنێ.
٨- بەس بۆ یەك ڕۆژ، كارەكەت لەگەڵ هاوڕێیەكی دیكەتدا، بگۆڕەوە.
٩- لە سەروبەندی بیركدنەوەدا، وێنەو شێوەی گاڵتەئامێز بكێشە.
١٠- لە چارەسەری ئەو كێشەیەی پێت سپێردراوە، بیربكەرەوە.. پاشان هەوڵبدە لایەنە باشەكانی ئەو چارەسەرە دیاری بكەیت.
١١- چەند بیرۆكەو چارەسەرێك- كە وا بەر چاو دەكەوێت، دەستكەوتنو پێگەیشتنیان دوورە دەست بێت- بخەرە ڕوو.
١٢- وەرزشێكی نوێ فێر ببە، (هەر چەندە لەوەوپێش ئەو جۆرە وەرزشەت نەكردبێت).
١٣- لە گۆڤارێكدا بەشداری بكە، كە لە بواری خۆتدا نەبێتو پێشتریش نەتخوێندبێتەوە.
١٤- ڕێگەی ڕۆیشتن بەرەو كارەكەت، بگۆڕە.
١٥- خۆت بە كاری سكرتێری هەستەو مۆڵەتێكی ناچاریی، بە سكرتێرەكەت بدە.
١٦- هەستە بە چاككردنو ڕێكخستنی ژوورەكەتو بۆ خۆشت جلو بەرگەكانت بشۆو هەر بە تەنهاش ئوتویان بكە.
١٧- ڕێكخستنی كەلوپەلی ناو نووسینگەكەت بگۆڕە.
١٨- بەردەوام خەون بە سەركەوتنەوە ببینەو بیری لێ بكەرەوە.
١٩- لە گشت كارێكدا هەنگاو بنێو هەر بە قسەو خۆزگە ڕازی مەبە.. چونكە داری خۆزگە بەری نییە.
٢٠- پرسیار زۆر بكە.
٢١- بڵێ نازانم.
٢٢- ئەگەر هیچ كارێك ناكەیت.. ئەوا بۆ پڕكردنەوەی كاتی بێكاریت، بیر لە كارێكی داهێنەرانە بكەرەوە.
٢٣- ئاگات لە بیرۆكە بچووكەكان بێت.
٢٤- ئەو خووو نەریتانەی لەسەری ڕاهاتوویت.. بگۆڕە.
٢٥- سووربە لەسەرئەوەی هەر شتێك دەیكەیت، شتێكە لە داهێنان.
٢٦- فێری یارییەكانی زیرەكیو بیركردنەوە ببەو ئەنجامیشیان بدە.
٢٧- لەبارەی داهێنانو داهێنەرانەوە، چیرۆكو هەڵوێستەكان بخوێنەرەوە.
٢٨- دەفتەرێك بۆ نووسینەوەی بیرۆكەكان دابنێو بیرۆكە داهێنەرەكانی -با بچووكیش بن- تێدا بنووسەرەوە.
٢٩- وایدابنێ كە هەموو شتێك دەكرێت.

## دەریای دڵ

و: وشیارعەلی/پێنجوێن

ڕۆژێك قوتابی ڕاهیبێكی بەساڵاچوو، داوای لە مامۆستاكەی كرد كە وانەیەكی فێر بكات. بۆ ئەوەی تا لە ژیانداماوە لە بیری نەچێتەوەو وەك ئەڵقەی زێڕلە گوێی بگرێت، مامۆستای پیر دوای هەندێك ڕامانو بیركردنەوە بە قوتابییەكەی گوت:»برۆ كیسەیەكی گەورە خوێ لەگەڵ خۆتدا بهێنەو بێرەوە».

قوتابییەكە ڕۆیشتو پاش كاتژمێرێك كیسە خوێی هێناو گەڕایەوە. ڕاهیبی بە ئەزموون كیسە خوێیەكەی لێوەر گرتو یەك كەوچكی لێكردە نێوپیاڵەیەك ئاوەوە،پاشان هەندێك شێواندیو بە قوتابییەكەی گوت:»ئەو سوێراوە بخۆرەوە».

قوتابییەكە فەرمانەكەی بەجێهێناو دەستبەجێ قومێكی لە ئاوەكەدا.. بەڵام هەر لەگەڵ تامكردنیدا خێراپیاڵەكەی گێڕایە دواوەو گوتی:»مامۆستا زۆر سوێرە».

ڕاهیبی پیر سەرێكی باداو قوتابییەكەی لەگەڵ خۆی برد بۆ كەنار دەریا، زۆر بە لێزانی هەمووخوێكەی ڕشتە نێو ئاوی دەریاكەوە،پاشان پیاڵەیەكی لە ئاوی دەریاكە پڕكردو بە قوتابییەكەی گوت:»بیخۆرەوە».

قوتابی دیسان فەرمانی مامۆستاكەی دووبارە كردەوە، بەڵام ئەمجارە هەموو ئاوەكەی خواردەوە...

مامۆستاپرسی: «چ تامێكی هەبوو؟؟»

قوتابی: «كەمێك سوێربوو، تەنهاپێویستی بە هەندێك ئا ڕامگرتن بوو!»

ڕاهیبی دنیادیدە سەری لەقاندەوەو گوتی: «ڕەنجو كێشەو گرفت گەلێك، كە مرۆڤ لە ژیاندا تووشی دەبێت، ڕاست وەك ئەو خوێیە وایە».

بۆیە ئەگەر دڵت بە ئەندازەی یەك پیاڵە بێت، ئەوا بە یەك كەوچك خوێ بڕستت لێدەبڕێتو ئەم گێتییە فراوانەت لێدەبێتە بیرێكی تەنگو تەسك. بەڵام ئەگەر دڵت وێنەی دەریا بێت، لێبگەڕێ.. یەك كیسە خوێو بەڵكو دەیان كیسەش ناتوانێت سوێری خۆی، لە دڵی تۆدا جێ بكاتەوەو ئا رامت لێ هەڵبگرێت..!!!

سەرچاوە: مجلە (روزهای زندگی)/ ژمارە ٣

بەشی دووەم

# گوڵدانی عەشق

ئاوارە عەلی مستەفا خەتی

٢/ ژیانێك لە چوار ڕۆژدا

ساتەكانی تەمەن وەك ئەو كێوە بەرزانەوان كە هەر تاكێك دەتوانێت بەپێداخی سەركەوتوویی خۆی تیادا هەڵبداتو لەگەڵ بەركەوتنی شنەباكان بشەكێتەوە، جوانترین سروتی كۆڵنەدان بچڕێت، بەڵام دەبێت لە پێناوی ئەم دەسكەوتە قبوڵی گشت سەختیو بەرزیو نزمییەكانی سەركەوتنی بكاتو لە تیژەڵەكانی نەسلەمێتەوە، وەك ئەو پەڕاوە سپیانەوان كە هەموومان دەتوانین بەوە بیان نەخشێنین كە خۆمان دەمانەوێت، بەڵام هەڵبەتە دەبێت بەرلەوە خۆت لەگەڵ خوێندەواریدا بسازێنیو كاتێك كە پەنجەكانت لە نووسین ماندوو دەبن تۆ كۆڵ نەدەییت، ئیدی وەك ئەو دەریاو سەردابەوان كە دەتوانین بۆ هەر لایەك بمانەوێت كەشتی تەمەنمان، یان ئەوەتا كاروانی تەمەنمانی بۆ ئاڕاستەكەین، بەڵام ئەمەشیان بەر لە دەسپێك ئاتاجی فێربوونی مەلەوانیو سوارچاكییە، لە هەموو ئەم پاڵەوانێتیانەشدا تۆ سەركردایەتی ئەم پرۆسەیە دەكەیتو لەدەرەنجامەكانیدا تەنها خۆت بەرپرسیاری، جا دەشێ گەر وانەكانی لێهاتوویی بزانیت لە كەمترین كاتدا بگەیت بە مەرامەكانتو لەگەڵ خۆشییەكانی سەركەوتن ئاهەنگ بگێڕیت، دەشێ لە كاتی نەبوونی لێهاتوویدا تووشی چەتەو بخۆرەكانی ژیان بیتو لە ناسكترین كاتەكانی تەمەنت بێ ئەوەی هەست بە خۆت بكەیت بە هێمنی لە ناوت بەرنو ئیدی بۆ هەمیشە لەگەڵ شكست ئالودە بیت.

یەكەم وانەی لێهاتوویش ڕێكخستنی كاتو بە هەدەر نەدانی چركەكانییەتی، كە بە هۆیەوە دەتوانیت لە كەمترین كاتدا زۆرترین سەركەوتن دەستەبەر بكەیت، ئینجا ڕەنگە بە لاتەوە سەیر بێت ئەگەر پێكهاتەی ژیانی مرۆڤێك تەنها بریتی بێت لە چوار ڕۆژ، هەڵبەتە چوار ڕۆژی پڕ لە ژیریو دانایی كە هەر تاكێك دەتوانێت لە میانەیدا توێشووی تەمەنێك زانیاریو ئەزموون دەستەبەر بكات.

ئەوەتا یەكێك لە زاناكان تەمەنی خۆی لە چوار ڕۆژدا چڕكردووەتەوەو دەڵێت: ژیانم بریتییە لە چوار ڕۆژ:

ڕۆژی یەكەم: تیایدا دەگەم بە كەسێك كە لە من شارەزاو بە ئەزموونترە، منیش زانیاری لێوە فێر دەبم، ئا ئەم ڕۆژە ڕۆژی وەرگرتنی سوودو زانیاری منە.

ڕۆژی دووەم: تیایدا دەگەم بە كەسێك كە من لەو زاناترو بە ئەزموونترم، ئەوەی هەمە پێی دەبەخشمو زانیاری پێ دەدەم، ئەم ڕۆژەش ڕۆژی كرێو پاداشتی منە.

ڕۆژی سێیەم: تیایدا دەگەم بە كەسێك كە وەك منەو لە لێهاتوویدا هاوشانی یەكترین، ئەو ڕۆژە لەگەڵیدا دەدوێمو زانیاری ئاڵوگۆڕ دەكەین، ئەم ڕۆژەش ڕۆژی وانەو دەرسو پەند وەرگرتنی منە.

ڕۆژی چوارەم: تیایدا دەگەم بە كەسێك

که له خوارووی منەو  من لەو شارەزاو بە ئەزموونتـــرم، کە چی ئـــەو وا دەزانێت لە ســـەرووی منەو لە من بـــە ئەزموونو زانا ترە، بۆیە نایدوێنـــمو گفتوگۆی لە گەڵدا ناکەم، ئەو ڕۆژەش دەکەم بە ڕۆژی پشـــوو و حەسانەوەی خۆم.

بۆیە لە دروستکردنی گوڵدانەکەماندا دەبێت بزانین:

١- ڕێکخســـتنی کاتو هەبوونـــی پلان یارمەتیـــت دەدات لـــە دەرفەتێکـــی چوار ڕۆژیـــدا کاڵاو بەرهەمـــی تەمەنێـــك ژیان دەســـتبخەیت، بـــە پێچەوانـــەوە ڕەنگـــە نەتوانیت لە تەمەنێکدا بەرهەمو توێشووی ژیانێکـــی چـــوار ڕۆژی فەراهـــەم بهێنیت، کەواتە دروســـتکردنی گوڵدانی ژیانیشـــت پێویستی بە ڕێکخستنی کاتە.

٢- ئەم گێتییە چەشنی شانۆگەرییەکە کە هەڵگـــری ڕووداوو دیمەنی گەشـــتێکی چوار ڕۆژەیە، تۆش کاراکتەری ســـەرەکیت تیایدا، دەبێت ڕۆڵی کەسایەتی  مامۆستاو قوتابیو گوێگرو دانا بگێڕیتو لەمیانەیدا ســـۆزی خەڵكو هەســـتو ڕێزی ئەوان بۆ خۆت ڕابکێشـــیت، بە واتای ئەوەی لەگەڵ دەوروبەردا خـــۆت بگونجێنە، گوڵ دەبێت لەگەڵ دڕکیش هەڵبکات!!

٣- گوڵـــەکان تا چرۆ دەکـــەن دەبێت نازیان بکێشـــیت، گەر بتەوێـــت ژیانت لە شـــێوەی گوڵدانێکی بۆنخـــۆش بێت، دەبێ زۆر بوێرانە پارێزگاری لە گوڵەکان بکەیت کە ئەویـــش ڕۆژەکانی تەمەنتن، هەربۆیە بزانـــە کە فێربـــوون هەوێنـــی هەوڵدانە، ســـەرکەوتن بەرهەمـــی مانـــدوو بوونـــە، خۆشەویســـتی دەرەنجامـــی لێبوردەییـــە، دانایـــیو لێهاتوویی دەرەنجامو پاشـــخانی ڕێکخستنی کاتو هەبوونی پلانە.

٤- گوڵ ئەوکاتە نرخی ڕاســـتەقینەی خۆی دەبێت کە تێکەڵ بە چڕی دارستانەکان دەبێت، بۆیە تاکی سەرکەوتوو دەیەوێت بە کەمترین کات زۆرترین زانیاری بە دەست بهێنێت، لەگەڵ زۆرترین کەسدا ئاشنایەتی دروســـت بـــکات، بۆیە کاتەکانـــت بە پێی گرنگیو جۆری کارەکانت دەستنیشان بکە.

٥- گـــوڵ بـــۆ خـــۆی جوانـــەو جوانی دەبەخشـــیو هەمیشـــە چـــرۆ دەردەخات، دەی تـــۆش بـــەردەوام لـــە ژیانـــدا کار بۆ بەرجەســـتەکردنی سێ شـــت بکە: زانست وەربگرەو فێربە، زانست ببەخشەو ئاسودە بە، زانیاریو ئەزمونەکانت مومارەسە بکەو لە بەرەنگاریو لەمپەرەکان مەترسە.

تێبینی/ لـــە کۆتایی زنجیرەکەدا ناوی ئـــەم ســـەرچاوانە دەهێنین کە ســـودمان لێبینیون.

# ئیرادەی مرۆڤ

شاخەوان جەبار

شـــتێکی بەڵگەنەویســـتە کە ئیرادەی مرۆڤ (خواســـت) یەکێکە لەو پێکهاتانەی جیهانـــی دووەمی مرۆڤ کە جیهانی هێزە نابەرهەستەکانییەتی، گەرچی بوونی ئەم هێزە لای زۆربەی مرۆڤەکان بە تایبەت لە ساتە وەختە ئاساییەکاندا دەرك بە بوونی ناکرێـــت، بـــەڵام ئەمە بەڵگـــەی نەبوونی ئـــەم هێزە نییـــە بەڵکو دەتوانیـــن بڵێین ئەوا ئەو کارتێکەرانە لەو دەمەدا بوونیان نییـــە کە دەبنە  هۆیەك بۆ لە دایکبوونی ئـــەم هێزە، جـــا با ســـەرنج بدەین کاتێك دەبینین گەورە بیرمەندی ئێرانی (دکتۆر عەلی شـــەریعەتی) کە نەیارەکانی ڕاپێچی نێو زیندانی دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئازارو ئەشـــکەنجە دوا چەکی دەستی نەیارەکانی دەبێت، کەچی ڕۆژێك ئەشـــکەنجەی نادەن پێیـــان دەڵێت: ئەمرۆ هەســـت بە دووری نێوان خۆمو خودای خۆم دەکەم، دەبینین (دکتۆر عەلی شـــەریعەتی) نـــەك ئیرادەی ئارامگرتـــن، بەڵکو ئەوینـــی نێوان خۆیو خودا لـــەم ئیرادەوە دەدۆزێتـــەوە، کاتێك باوەڕی ئاینـــی وەك کارتێکەرێك ئیرادەی ئارامگرتنی بۆ وەدی دێنێت.

یان ئەودەمەی (ئیبن الحجر) ئیرادەی زانســـت لە ڕامانی نموونەیەکی ســـاکارەوە دەدۆزێتەوە کە دڵۆپە ئاوێك زۆربەسانایی لە جەســـتەی بەردێك دەداتو زەبری ئەم دڵۆپـــە ئـــاوە بـــە بوونی چاڵێك لە ســـەر بەردەکە بە دیار دەکەوێت!

یان ئەو کاتەی کە کەســـێك تاکێك لە پێڵاوەکەی کەمێك دڕابێت دەبینین ئیدی واز لە ڕۆیشـــتن دێنێـــتو بڕیاری گۆڕینی پێڵاوەکـــەی دەدات کەچـــی هەمان مرۆڤ کاتێك ســـاتە وەختێکی نائاسایی بۆ دێتە پێش نەك بە پێڵاوی دڕاو، بەڵکو بە پێی پەتی (پێ خاوس)و بە خراپترین ڕێگا وەك جارانو بەڵکو پتریـــش هەلی ڕزگاربوون، یان گەیشتن بە مەبەست دەدات.

ئەو دەمەیـــش بێنە بەر نیگا کە هەر یەکێـــك لە ئێمە گەر ژەمێك لە ژەمەکانی خواردن، خۆراك نەخۆین ئەوا جۆرێك لە نا ئومێدی لە ڕووخسارماندا بە دی دەکەین، یان هەندێجاریش دەگاتە ئاســـتی تووڕەیی بە تایبەت ئەو کاتەی کە برسێتییەکی زۆر بەرۆکمـــان دەگرێت گەرچی لەو کاتەشـــدا ئاو بە بەردەوام بوونی هەبێت، بەڵام گەر ســـەرنج بدەیـــن دەبینین هەمـــان مرۆڤ کاتێك کـــە مانگێکی وەك ڕەمـــەزان دێتە پێشێ ئێمە نەك برسێتی بێ مانا دەکەین، بەڵکـــو ئاو خواردنەوەیش بە درێژایی ڕۆژ لە خواردن نەفی دەکەین!!

کەواتـــە ئەمـــەش کارتێکـــەری ئاینە بۆسەر تاکەکان کە بە جۆرێك لە جۆرەکان ئیـــرادەی ئارامگرتن لـــە بوونی متبووەوە دەخاتە جوڵە.

جا لە ســـۆنگەی ئـــەوەوە دەگەین بەو ڕاســـتییەی کـــە بڵێیـــن ئیـــرادەی مرۆڤ: ئـــەو وزەو هێـــزە متبـــووەی نێـــو ناخی هەرتاکێکـــە کە لە ســـاتە هەســـتیارەکاندا دەبزوێـــتو بوونـــی خۆی دەســـەلمێنێت، بۆیە گەر ئێمەش بمانەوێت لە هەر کاتو شـــوێنێکدا ســـەرکەوتن مسۆگەر بکەین ئەوا دەبێت بـــە جۆرێك لە جۆرەکان ئەو حاڵەتـــە هەســـتیارانە بێنینـــە بـــەر نیگا کـــە بە ئەندازەی ســـەرکەوتن وزەو هێزی ئیرادەمان بۆ دەخولقێنێت.

# ڕازو نهێنییەکانی کەسێتی سەرکەوتوو لە ژیاندا

سەردار عبدالرحمن ئیبراهیم

* کەسێتی سەرکەوتوو: بە پێویستی نازانێت هەموو ڕووداوەکانی ژیانی خۆی بۆ کەسانی تر باس بکات. هەروەها ئەگەر بزانێت بە وتنی ڕاستییەك هەستی کەسێك دەڕوشێنێت بەشێوەیەکی تر ئەو ڕاستییە باس دەکات.

* کەسێتی سەرکەوتوو: ئەو مافە بەڕەوا دەزانێت بۆ خەڵك کە خۆیان بڕیار لەسەر ژیانی خۆیان بدەنو هەرگیز سەلیقەی خۆی وەرنەداتە ناو بڕیارەکانیانەیەوە.

* کەسێتی سەرکەوتوو: کاتی خۆی بە داوەریکردن لەسەر ژیانی خەڵك بە فیرۆناداتو لە جیاتی قسەکردن لەسەر ژیانی خەڵك لەگەڵ خەڵکدا قسە دەکاتو لە جیاتی بە هەڵە دانانی ئەوان لە کارەکانیاندا یارمەتیان دەدات. بۆئەوەی کەمووکوڕیان نەهێڵێتو بزانن بەرپرسیارییەتیان لە ئەستۆدایە.

* کەسێتی سەرکەوتوو: لەو جۆرە کەسانە نییە لێرەو لەوێ دانیشێتو دەست بکات بە دەنگۆ بڵاوکردنەوەو وڕێنە بکات. چونکە بە جۆرێك بە ژیانی خۆی سەرقاڵە فریای ئەو شتانە ناکەوێت.

* کەسێتی سەرکەوتوو: لەو بڕوایەدایە ئەوانەی ئەهلی کارن خەریکی کارو تێکۆشانو فزوڵو چاودێری کارەکانیش تەنها سەیر دەکەنو جیا لە لۆمەو سەرزەنشتکردن هیچی تریان لە دەست نایەت.

* کەسێتی سەرکەوتوو: شەوانە کە تاریکی دادێتو ئەستێرەکان دەگەشێنەوە. ئەو دەمانەی هەورو تەم ئاسمانی شین دەگرێت. ژیان خۆی گرمۆڵە دەکاتە ناو هێلانەی چۆلەکەیەکەوە، کە دەرگاکان داخران، پەنجەرەکانی ڕۆح دەکرێنەوە. دواجاریش هەروەك چۆن باڵندەکان دەتوانن بفڕن بۆ ئاسمان کەسییەتی سەرکەوتوش دەتوانێت لە هەموو کات و ساتێکی تەمەنیدا بژیت.

* کەسێتی سەرکەوتوو: ئەو مرۆڤانەن کە گەشبینو بە هیواوە دەژین هەمیشە کەسانێکن کە دەتوانن پەی بە بازنە تاریکەکانی ژیان بەرنو جوان پێبکەنن. بە پێچەوانەوە ئەو مرۆڤانەی کە ڕەشبینن هەموو شتێك لە دەلاقەی تەڵخ و لێڵو گۆشە نیگای تاریکییەوە دەبینن کەسانێکن نوقمی بێهودەییەکی گەورە بوون.

* کەسێتی سەرکەوتوو: خاوەن توانایەکی گەورەیە کە دەتوانێت ببێتە کەسێکی داهێنەرو بەهێزو بە توانا. دەتوانێت مێژوو دروست بکات. زیندوویەتی بە ژیان بدات. دەتوانێت کاری ناوازەو خەیاڵ پەروازی بکات. توانای کەسێتی سەرکەوتوو بە شێوازێکە کە دەتوانێت بە گژ هەموو ئەستەمو حاڵەتەکانی ژیان ببێتەوە.

* لای کەسێتی سەرکەوتوو هەموو هەنگاوەکانی پەیوەستە بە بەرنامەڕێژی. چونکە نەبوونی بەرنامەڕێژی ئاییندە دژوار دەکات.

* هەرگیز ئومێدو ئارەزوو دەستبەرداری کەسێتی سەرکەوتوو نابن.

* کەسێتی سەرکەوتوو بەڵێنەکانی بە کردەوەیە لە بچوکترین کێشەی کۆمەڵایەتیدا کارێکی بچوووك دەکات کە زۆر چاکترە لەوەی کە لە گەورەترین کێشەی مرۆڤایەتیدا ڕای خۆی دەرببڕێت.

* کەسێتی سەرکەتوو: سەرکەوتنەکانی یەکێکن لە نیشانەکانی پلەوپایە.

* کەسێتی سەرکەوتوو: ڕەوشتو ژیانی پەیوەستە بە شێوازی بیرکردنەوەی کەسەکە خۆی.

* کەسێتی سەرکەوتوو: گرنگی لەوەدا نییە کە هەرگیز شکست نەخوات. بەڵکو لەوەدایە کە هەرکاتێك تووشی شکستهات لە جێگای خۆی هەڵدەستێتەوەو لە دەلاقەیەکی ترەوە هەنگاوەکانی تری دەست پێدەکاتەوە. چونکە گرنگ لەوەدانییە کە هەڵە نەکەیت، بەڵکو گرنگ لەوەدایە کە لە هەڵەکان پەند وەربگرین.

* کەسێتی سەرکەوتوو: ئاماژە بەوە دەکات کە بەدبەخترین کەسایەتی ئەو جۆرە کەسایەتیانەیە، کە حەز دەکەن کەسێکی تر بن کە جیاوازە لە کەسایەتی خۆی بە گیانو بە جەستە.

* بوونی پشوو درێژی لەشتە بچووکەکاندا لە لای کەسێتی سەرکەوتوو هۆکار گەلێکن بۆ سەرکەوتنی نەخشەو پلانە گەورەکانی ژیان. چونکە بێ ئومێدیو نەبوونی پشوو درێژی کۆسپێکی گەورەیە لە بەردەم سەرکەوتنەکانی ژیاندا.

* هەر شتێك سروشتی بێت کەسێتی سەرکەوتوو لێی تێ بگات پێی جوانە.

* کەسێتی سەرکەوتوو: کاتێك کتێبەکان دەخوێنێتەوە، ڕاستەوخۆ مامەڵەو گفتوگۆ لەگەڵ زاناکان دەکەن.

* لای کەسێتی سەرکەوتوو شادی سەرەنجامی ئاسانکاری نییە، بەڵکو زاڵبوونە بەسەر دژواریدا.

* کەسێتی سەرکەوتوو: بڕوایان بە تواناکانی خۆیان هەیە چاوەڕوانی کەسانی دی، یان هێزێکی دی نین کە بێت ڕزگاریان بکات. کەسانێکن کە هەموو کاتو ساتێکی تەمەنی خۆیان خۆش دەوێت. بەدبەخترین کەسانێك لە ژیان ئەوانەن کە قەدری ساتەکانی ژیانیان نازانن بە بێهوودەییو بێ بەرنامەییەوە بە هەستێکی لاوازەوە لە ژیان دەڕوانن. لە ڕاستیدا ئەوە خۆمانین کە زۆرجار هەموو پەنجەرەکانی ئومێدو خۆشبەختی بە ڕووی خۆماندا دادەخەینو سەراپای ڕۆحمان شلاڵی بێهودەیی دەکەین.

* نموونەی کەسێتی سەرکەوتوو ئەوەیە کە لە هەموو گۆڕانکارییەکاندا پێشکەوتن دەستەبەر دەکات. چونکە مەرج نییە هەموو پێشکەوتنێك گۆڕانکاری بێت.

*کەسێتی سەرکەوتوو لە بری ئەوەی نەفرەت لە تاریکی بکات مۆمێك دادەگیرسێنێت. چونکە هەموو تاریکییەکانی ژیان ناتوانێت ڕووناکی مۆمێك بشارێتەوە.

* بە لای کەسێتی سەرکەوتووەوە سێ شت پێویستن لە ژیاندا (ویژدان، قەناعەت، لە یەکتری گەیشتن).

* کەسێتی سەرکەوتوو: ڕاستو دروستییەکانی خۆش دەوێتو لە هەڵەکانیش دەبوورێت. چونکە مرۆڤ زادەی کاروکۆششو بیرکردنەوەی خۆیەتی.

* کەسێتی سەرکەوتوو ئەو کاتەی بەختیارە هەمیشە شادە. بەڵام خەڵکانی ڕەشبین ئەو کاتەی باشە مەرج نییە بەختیار بێت.

* ڕوویەکی دەم بە پێکەنین لای کەسێتی سەرکەوتوو باخچەیەکە لە ناوەڕاستی زستاندا.

* کەسێتی سەرکەوتوو بڕوای بە تواناو ئیرادەی مرۆڤ هەیە کە سەرچاوەی سەرکەوتنی ژیانە. دەتوانێت مێژوو دروست بکاتو ژیان بگۆڕێت. ئەو توانایەش پەیوەندی بە خودی خۆمانەوە هەیە کە ئێمە چین؟ چی دەکەین؟ بۆ دەژین؟ چۆن زیندوییەتی بە ژیان دەدەین؟

* ڕەمزو کلیلی سەرکەوتووەکانی کەسێتی سەرکەوتوو ئیرادەیە.

* بۆ کەسێتی سەرکەوتوو هەموو ڕۆژێك سەرەتای ژینێکی نوێیە.

* کەسێتی سەرکەوتوو لە لێوەکانی ڕاستگۆیو لە دەنگی وێردی نوێژو لە چاوەکانی دلۆڤانیو لە دەستەکانی چاکەکردن. بە ژنو باڵای ڕاستکاریو لە دڵیشیدا خۆشەویستییەکی بێ وێنە بە دی دەکرێت.

* کەسێتی سەرکەوتوو ئەڤین بە چاو سەیرناکات، بەڵکو ئەڤینو خۆشەویستی بە ڕۆح سەیر دەکات.

* کەسێتی سەرکەوتوو: ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤەکان با بە دوای بەختەوەریدا لە دەرەوەی خۆیاندا نەگەڕێن، چونکە لە دەروونی خۆیاندا هەیەو ئەوان لێی بێ ئاگان.

* کەسێتی سەرکەوتوو لە دڵییەوە بیری مەزن دەردەچێت.

* لای کەسێتی سەرکەوتوو ئەو ساتانەی فرمێسکی بێ ئومێدی دێتە چاویەوە، ژیان لە خۆی تاریك دەکات هەر لەو ساتەدا دەتوانێت نهێنییەکانی خۆشبەختی بدۆزێتەوەو جوان پێبکەنێت، چونکە ژیان بە بێ هیواو ئامانج دۆزەخێکە لە بەهەشتدا.

* کەسێتی سەرکەوتوو لە کاتی گفتوگۆکردندا گوێی زیاتر عاشقتر دەبێت لە چاو.

* هێمنی لای کەسێتی سەرکەوتوو کلیلی هەموو دەرگایەکە.

* کەسێتی سەرکەوتوو بۆ تێڕوانینی ژیان هەموو ڕۆژێك خۆی نوێ دەکاتەوە.

* کەسێتی سەرکەوتوو ڕۆژگارەکانی بە باڵی شادیو بەختەوەریو گەشبینی دەفڕێت.

* کەسێتی سەرکەوتوو شێوەی دارێکی لقو پۆ چڕە باڵندەکان هێلانەی تیایدا دروست دەکەن. چونکە کەسێك سوودی نەبێت بۆ گەلەکەی ئەوا کەسێکی بێ نرخە.

* خەڵك بەردەوام هەڵەکانی خەڵکی تر دەژمێرن، بەڵام کەسێتی سەرکەوتوو چاکەی دوای خۆییو پێش خۆی دەژمێرێت، دەیکاتە ڕێبەر بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای پێشکەوتنی ژیان.

* کەسێتی سەرکەوتوو: پرسیارکردنی پێ لە وەڵام گرنگترە، چونکە هەر پرسیارێك دەرگایەك بەرەو گەشبینیو ئومێد دەکاتەوە.

*ڕووی کەسێتی سەرکەوتوو ئاوێنەی دەروونییەتی.

* کەسێتی سەرکەوتوو: جوانبینیو خۆشەویستی ژیانی بە هەموو ساتە خۆشو ناخۆشییەکانییەوە گرێ دەدات بە ڕۆحی خۆیەوە، چونکە پەیوەندی بە شێوازی بەڕێوەچوونی ژیانی خۆیەوە هەیە.

* دەستپێکی هەر کارێکی کەسێتی سەرکەوتوو واقورمانە.

* ئومێدو ئارەزوو بەنرخترین گەوهەری کەسێتی سەرکەوتوون.

* زەردەخەنەی کەسێتی سەرکەوتوو تیشکێکە لە تیشکەکانی گەردوون.

* پشوو درێژی بەرزترین هونەری کەسێتی سەرکەوتووە.

* کەسێتی سەرکەوتوو زیاتر لە جەستەی خۆی گرنگی بە دیدگاو تێڕوانینەکانی ژیانی دەدات.

* کەسێتی سەرکەتوو بۆ ڕێگای چوونە ناو خەڵکانی تر لە ڕێگای ئارەزووەکانیانەوە دەدوێن.

* لای کەسێتی سەرکەوتوو ئەو کەسە بەختەوەرە کە دەیەوێت کەسێکی تر بەختەوەر بکات.

* کەسێتی سەرکەوتوو هەمیشە وەك مانگ وایە کە ڕۆژانە ڕووناکی لە خۆر وەردەگرێتو لە شەوانی تاریکیدا ڕووناکی خۆی پەخش دەکات.

* داهاتوو بۆ کەسێتی سەرکەوتووە، چونکە دەزانێت چۆن چاوەڕوانی دەکات.

* کەسێتی سەرکەوتوو زیاتر خۆڕاگری دەنوێنێت لە کارەکانیداو زەبروزەنگیش بەوە دەچوێنێت کە بریتییە لە نەزانینی مامەڵەکردن لەگەڵ ژیاندا.

* ئاوێنەی کەسێتی سەرکەوتوو ئەنجامەکەیەتی.

* کەسێتی سەرکەوتوو، سەرکەوتنەکانیان ئاوێتەی ژیانیان دەکەن.

* لای کەسێتی سەرکەوتوو ڕێگایەك بەرەو شادمانی نییە شادمانی خۆی ڕێگایە.

# من شێت نیم، بەڵکو تۆ نیم!

سەروەر حەسەن

ئەوە بۆچی هەندێجار خۆشەویستان کە ماوەیەك پێکەوە دەژین لێك زویر دەبنو زۆرجار مشتومڕی بێ بنەما لە نێوانیاندا دەقەومێت؟ ئەی بۆچی گەلێکجار هاوڕێکان لە پاشملە باسی خەسڵەتە ناجوانەکانی هاوڕێکانیان دەکەن؟! باشە چی دەبێت ئەگەر هاوسەر، یان هاوڕێ، یاخود هاوکارەکانمان لەگەڵمان هاوڕا نەبوون، پیایاندا هەڵنەشاخێین، بەڵکو هەقیان پێ دەدەین بۆچوونی جیاوازیان هەبێت؟! تۆ بڵێی نەنگی بێت ئەگەر خەڵكو نزیکان لە شتێکدا لەگەڵماندا هاوڕا نەبوون؟! ئەی ئەگەر هاوڕێکەم لە هەموو بیروبۆچوونەکاندا لەگەڵمدا نەبوو دەتوانم لە هاوڕێیەتی بەردەوام بم؟! ئاخۆ جیاوازییەکان ژیان جوانو ڕازاوە دەکەن، یان بێتامو ناشیرین؟!

ئەگەر بە خێرایی تەماشای کەسانی دەورووبەرت بکەیت بە کەسە نزیكو خۆشەویستەکانتو نەیارەکانیشتەوە، دەبینیت بەبێ هاڵاوێردن لەگەڵ هەر هەموویاندا خاڵی هاوبەشو خاڵی جیاوازیت هەیە. لە یەکێك لە خۆشەویستانت وردبەرەوە هەست دەکەیت چەند خاڵێك لە بیرکردنەوەو ئاکارو ئاخاوتنیدا هەیە تۆ لەگەڵیدا هاوڕا نیت، بە هەمان شێوە لە یەکێك لە نەیارانت ورد بیتەوە چەند خاڵێکی جوان لە کەسایەتیدا دەبینیت، ئومێدەواریت بت توانیایە هەندێکیان لە کەسایەتی خۆتدا بئافرێنیت.

گەلێکجار پریشکی سەرەتای پەشێویو هەراو مشتومڕە بێ بنەماکان جیاوازییەکی بچووك بووە لە بیروبۆچوون دەربارەی مەسەلەو هەڵوێستێك کە دوای ئاساییبوونەوەی هەردوولا تێدەگەن مەسەلەکە شایستەی ئەو هەموو لێوردبوونەوەو قووڵکردنەوەیە نەبوو.

باشترین مامەڵە کە لەگەڵ جیاوازییەکاندا بکرێت تەرکیز کردنە بۆ سەر خاڵە هاوبەشەکان، چەند تەرکیز بکرێتە سەر خاڵە هاوبەشەکان هێندە خاڵەکانی جیاوازی بچووك دەبنەوە، بە پێچەوانەشەوە چەند بیرمان لەسەر خاڵە جیاوازییەکان کۆکردەوە، هێندەش خاڵە هاوبەشەکان بچووكو بچووکتر دەبنەوە.

بمناسە پاشان ببەرە هاوڕێم، کە بوویتە هاوڕێم وەك خۆم قبووڵم بکە، مەرج نییە لە هەموو وردەکارییەکانی بیرکردنەوەو ڕەوشتو کاردانەوەکاندا وەك یەك بین، بەڵام هەمیشە لە بیرت بێت کە منیش خۆم بەو هەوڵ مەدە بم کەیتە خۆت. کەس لە ئێمە (خۆیشی بیەوێت) ناتوانێت ببێتە کەسێکی تر، تەنانەت ئەکتەرەکانی دراماو سینەماش کە ڕۆڵ دەبینن، هەندێك خەسڵەتی مامەڵەو هەڵسوکەوتکردنی وردی تایبەت بە خۆیان (بە بێ ویست، یان بە ویست) تێکەڵ بە کاراکتەرەکە دەبێت. کەواتە قەناعەت بەوە بهێنە بە ئەندازەی ژمارەی مرۆڤەکان سروشتو دەروونو دونیابینی جیاواز هەیە.

تۆ بڕوانە، ئەگەر تەنها ئارەزووەکانمان، وەك یەك بێت، ژیان بە ئاسایی بەردەوام نابێت، چونکە هەموومان دەبینە کۆپی یەکتر.

کە ئێمە (ئەندامانی کۆمەڵگا) جیاوازی لە نێوانماندا هەیە مانای وا نییە ئیتر ناتوانین پێکەوە بژین، بەڵکو بە هەموو جیاوازییەکانمانەوە (ئەگەر لە ئاستی قووڵی بیروبڕواو بەهاکانیشدا بێت)، بە مەرجی یەکتر قبوڵکردن، پێکەوەش دەژینو خۆشەویستی زۆریش لە نێوانماندا دروست دەبێت.. دیارە کە زۆر جار دەستپێکردنی مامەڵەو پێکەوەژیانو هاوکاریکردنو تەنانەت خۆشەویستیو عەشقو شەیدابوونیش لە خاڵێکی هاوبەشی زۆر ساکارەوە دەستی پێ کردووە.

لە ڕاستیدا ژیان زۆر بە چێژ دەبێت ئەگەر نێوان هاوڕێو خەڵك لە کۆمەڵگادا لێکتێگەیشتنو یەکترقبوڵکردن هەبێت، دەنا دەبێتە دۆزەخ!

گرنگە ئاگامان لەوە بێت مەرج نییە هەموو ئەو شتانەی ئێمە بە ڕاستیان دەزانین هەقیقەتی ڕەها بن، تەنانەت ئێمە هەموو زانیارییەکمان دەربارەی خودی خۆشمان نییە، زۆرجار ڕەتکردنەوەی یەکجارەکی بەرامبەرەکانمان لە کەم زانیاریو کەم ئەزموونیمانەوەیەو هیچی تر.

کەواتە خۆت بە ڕاستەقینەی ڕەها مەزانەو لێگەڕێ بەرامبەرەکەشت ڕای خۆی دەربارەی شتو مەسەلەو پێشهاتەکانو پێشبینی تایبەتی بۆ ئایندە هەبێتو بە سوك تەماشای بیروبۆچوونەکانی مەکە، چونکە بەرامبەرەکەت بەو جۆرە ئەو مەسەلەیە دەبینێت، ئەوەش نە سەیرەو نە شێتییە.

گوڵان حەمە ئەمین

# باڵە لە نێو خۆشەویستیدا ئارامی بدۆزینەوە

ئارامی بووەتە ئەو خولیایەی کە هەمووان خەونی پێوە دەبینین، هەموومان بۆ ئەوە دەخوێنین، بۆئەوە کاردەکەین، بۆ ئەوە خێزان پێکدەهێنین، بۆئەوە سەفەردەکەین.. کە بگەین بە ئارامی، ئاسوودەییو چێژی ڕاستەقینە لە ژیان بکەین، بەڵام لە ڕاستیدا وێڵ بوون بە دوای بەختەوەریو ئارامیدا، وەك نموونەی نابینایەك وایە کە بە شوێن ڕووناکیدا بگەڕێت، چۆن نابینا هەر چەندە ڕووناکی دەست بکەوێت سوودی پێناگەیەنێت، چونکە خودی خۆی چاوی نابینێت، بەڵام ئەو کەسەش کە نازانێت بەختەوەری ڕاستەقینە کامەیە بە هەمان شێوەیە با هەموو هۆکارەکانی بە دەستهێنانی بەختەوەری دەستبخات بە مەرجێك لە ناخی خۆیدا چراخانی بەختەوەری نەبێت، هیچ شتێك بە بەختەوەری ناکات و سوودی پێناگەیەنێت.

هەمووان کەسانێك دەبینین کۆشکەکانیان بەرزکردووەتەوەو باشترینو تازەترین ئۆتۆمبێلو گەشتوگوزارو بڕوانامەو... بەڵام چێژ لە ژیان نابینن!

کەواتە بەختەوەری چییەو لە چیدایە؟ چۆن بەدەست دێت؟ کێ بە دەستی دێنێت؟ دەتوانین هەموو واتاکانی بەختەوەری لە خۆشەویستیدا کۆبکەینەوە، بەڵام چۆن؟ کام خۆشەویستی؟ مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی لە خۆشەویستییە بە هەردوو باردا هەم خۆشویستراو بێت هەم خۆشەویستی هەبێت، چونکە مرۆڤ کە گەیشتە پلەی عاشق بوون ئیدی هەمیشە دڵخۆشە، بە شەوقو دڵخۆشە، ماندوو نابێت، هیچ شتێك بە ڕێگر نازانێت، بۆ ڕێگری کردن لە خۆشەویستییەکەی، چونکە کەس توانای نییە دەسەڵاتی بەسەر دڵی کەسدا هەبێت، مرۆڤ حەز دەکات کەسێك هەبێت خۆشی بووێت، ڕێزی بگرێت، هاوکاری بکات، چاودێری بکات، گومانی خراپی پێ نەبات، چونکە چەندەها کۆشکی خۆشەویستی دەبینین بە هۆی هەڵە تێگەیشتنو گومانی خراپەوە دەڕوخێت.

دیارە ئەوەی کەباسمان کرد لە١٠٠٪ تەنها لە پەروەردگاردا بوونی هەیە، کە خۆشەویستێکە هەمیشە چاودێریت دەکات، ئەو کاتەی بە ئاگای، ئەو کاتەی بێئاگایت، تەنانەت لە شتانێك دەتپارێزێت کە جگە لەو هیچ کەس توانای نییە بە سەریدا، کێیە لە ڤایرۆسو میکرۆبێك دەتپارێزێت کە بە چاو نابینرێت، کێیە بەردەوام چاودێریت دەکات، خانەکانی لاشەت بۆتازە دەکاتەوە، کاتێك خەوتووی کێیە بە ئاگات دەهێنێتەوە؟ خۆشەویستێکە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە هەمووکات گوێی لێتە، وەڵامت دەداتەوە، تەنانەت وەڵامی ئەو حەزە پەنهانانەشت دەداتەوە کە لە ناختدا پەنهانت داوەو ڕووت نەهاتووە لە خزمەتیا بیدرکێنیت.

چ خۆشەویستێك ئەوەندە نزیکە لێتەوە ئەوەندە نازت دەکێشێت؟ پەروەردگارێك کە کەمترین پێویستی بە بەندەکانی نییە، بەڵام هیچ کات لە یادیان ناکات تەنانەت ئەو بەندانەش کە زیادەڕۆییان کردووە لە گوناهو تاواندا، بەوپەڕی سۆزوئەوینەوە بانگیان دەکاتو دەفەرموێت: (ئەی بەندەکانم ئەوانەی کە زیادەڕۆیتان کردووە لە گوناهوتاواندا بێ ئومێد مەبن لە بەزەیی خوای گەورە)، هەر بانگکردنەکەی پڕیەتی لە خۆشەویستیو ئەوین کە دەفەرموێت: (یاعیبادی)، ئەمەش گوزارشت لە خۆشەویستی دەکات.

هەروەك چۆن حەز دەکات خۆشویستراو بێت، بەو شێوەیەش حەز دەکات کەسێکی هەبێت کە خۆشی بووێت، کە ڕازونیازو داواکانی لاباس بکات، داوای هاوکاری لێبکات، هەمیشە ناوی لەسەر زاری بێت، حەز دەکات فەرمانی پێبسپێرێتو گوێڕایەڵی بکات، هەروەك چۆن خۆشەویستی ڕاستەقینە دەیەوێت لەوە زیاتر ئەنجامبدات کە لێی داواکردووە، ئەمەش لە هەردوو خۆشەویستی حەقیقیو مەجازیدا هەر بەوشێوەیە، بەڵام ئایا هیچ کات هەستت بە گەورەیی خۆشەویستی پەروەردگار کردووە؟ بیرت کردووەتەوە لەوەی کە چۆن تۆی دروستکردووەو ژیری پێداویت؟ بە زمانی مرۆڤ گفتوگۆمان لەگەڵدا دەکات، دەفەرموێت: (داوام لێبکەن وەڵامتان دەدەمەوە).

کێ لە ژیانتدا ئاوا بانگت دەکات، کێ ئەوەندە دەت دوێنێت هاوکاریت دەکات بێ بەرامبەر؟ دەی کەسێك کەسێکی خۆشدەوێت، چۆن دەچێتە شوێنێك کە خۆشەویستەکەی پێی ناخۆش بێت! چۆن کارێك دەکات کە خۆشەویستەکەی پێی ناخۆش بێت! مرۆڤ کاتێك لە خۆشەویستی پەروەردگار دابڕا ئیدی ناتوانێت نەپشتی پێ ببەستێت، نە داوای لێ بکات، بەمەش لە پەروەردگاری دادەبڕێت، کە مرۆڤیش لە پەروەردگاری دابڕا وە ك ئەو هێڵی مۆبایلە وایە کە پەیوەندی بە کۆمپانیاکەیەوە کە دروستی کردووە داببڕێت، چۆن لە کاردەکەوێت ئاوەهاش مرۆ هەر ڕواڵەتی دەمێنێتەوەو لە ناخیدا لە کاردەکەوێتو هەست بە خۆشییەکانی ژیان ناکات، هەروەك چۆن ناشتوانێت پەیوەندی بە غەیری خۆیەوە پەیوەندییەکی تەواوبێت، بە هەمان شێوەی هێڵی مۆبایلەکە، ئەو مرۆڤەش کە عاشقی ڕاستەقینەیە هەمیشە دڵخۆشە، دەم بە خەندەیە، ترسی نییە، بێ ئومێد نییە، چونکە دەزانێت هێزێك پشتیوانی دەکات بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە، خۆشەویستێکی هەیە هەرچەند خۆشی بووێت ئەو زیاتر خۆشی دەوێت، هیچ کات لە یادی ناکات... دەی جگە لەمە بەختەوەری کامەیە؟ ئەو مرۆڤەی بگاتە ئەم پلەیە بە زمانی حاڵ بە دەوروبەری دەڵێت: گەربزانن من لە چ خۆشییەکدام، هەمووان خۆزگەتان پێ دەخواستم!

و: دونیا محسن فاتح

# چەند شێوازو ڕێگایەکی سەرکەوتن

لە بیرمان بێت ڕێگەکانی سەرکەوتن پێویستی بە فێربوونە، تەنها جیاوازییەك لە نێوان تۆو کەسێکی سەرکەوتوودا هەبێت، ئەوەیە کە ئەوان هەمیشە هەندێك ڕێگای تایبەت بەکاردێنن کە دەبێتە هۆی سەرکەوتنیان.

سەرکەوتن. واتە کۆکردنەوەی ڕێگاکانی ژیان، ئێمە لێرەدا چەند ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی سەرکەوتن دەخەینەڕوو.

١- بە وردی پۆشاك لەبەر بکە: پێش چوونە دەرەوە لە ماڵو چوون بۆ شوێنی کارکردن، کاتێك تەرخان بکە بۆ چاو خشاندن بەپۆشاکەکانتدا، ئەوە بزانە کە پۆشاکێکی ڕێکت لەبەر کردووە، یان نا، لەوانەیە هەندێك بڵێن پۆشاك هیچ گرنگییەکی نییە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە هەڵەیە، چونکە دونیای کاروبازرگانی تا ئەندازەیەکی زۆر لەسەر ئەم بابەتە دەسوڕێت. ئەگەر وەکو کەسێکی سەرکەوتوو پۆشاك لەبەر بکەیت، خەڵکیش وەکو کەسێکی سەرکەوتوو هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن. کەواتە لەبارەی پۆشاك لەبەرکردنەوە بیربکەرەوە.

٢- وەکو سەرکەوتووەکان دابنیشە: هەڵسوکەوتی کەسەکە ڕۆڵێکی گرنگ لەسەرکەوتندا دەبینێت، چاوەکانتان هەرگیز نابێت وەکو شکستخواردووەکان بێت، واباشە پێشکەوتنەکانت، یان بەدەست هێنانەکانت کە هەوڵیان بۆ دەدیت لە پێش چاوت وێنایان بکەیت، هەمیشە نیوە پڕەکەی پەرداخەکە تەماشا بکە، کەسایەتی سەرکەوتوو هەمیشە پۆزەتیفیانە بیر دەکاتەوە، نەك نێگەتیفانە.

٣- یەکێك بن لە کەسانی ناو گروپ: سەرکەوتن زۆربەی جارەکان بە کارێکی گروپی دەبێت، گۆڵکەرێك لە یاری تۆپی پێدا هیچ کات بە تەنها ناتوانێت سەرکەوتوو بێتو بە ئاسانی گۆڵ تۆمار بکات، بە یارمەتیو هاوکاری کەسانی ناو گروپەکە سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت، ئەگەر لە ناو گروپێکدا کار دەکەیت تا لە تواناتدا هەیە کارەکانت بە باشی ئەنجام بدە، هەمان چاوەڕێش لە خەڵکی بکەن، لەم کاتەدا دەتوانیت سەرکەویت.

٤- زیرەکی لە پەیوەندیدا: یەکێك لە ڕێگەکانی گەیشتن بە سەرکەوتنی ئێوە، زیرەکی لەپەیوەندیدایە، وێنای خۆتان بکەن کە لە کۆبوونەوەیەکدان، بەڕێوبەرەکەتان داوای ڕای تۆ دەکات، ئێوە بە ڕێکی دەزانن کە دەبێت چی بڵێن تاکێشەکە چارەسەر ببێت، بەڵام لە وتنی کێشەتان هەیە، ئالێرەدایە کە دەبێت فێری پەیوەندی ببین لە نێوان خۆمانو خەڵکیدا، کەواتە پتەوی پەیوەندی بنەمای سەرەکی سەرکەوتنە.

٥- هەمیشە کۆتایی کارەکەت لە مێشکتدا بێت: هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەین بێگومان هۆکارێکی هەیە. بۆ گەیشتن بە ئەنجام دیارە کە ئەم کارانە دەکەین، لە کاتی کارەکەشدا هەروایە، هەروەها ئەو کارەش کە حەزتان لێیی نییە ئەگەر بیر لە کۆتاییەکەی بکەیتەوە لەگەڵ ئەو ئەنجامەی کە بیری لێ دەکەیتەوە، تواناتان پێدەبەخشێت.

٦- بزانن لە پشتی تەلەفۆن چۆن گفتوگۆ دەکەیت: گرنگ نییە ئێوە ئیشتان چییە، تەلەفۆن هەمیشە یەکێك بووە لە شتە گرنگەکان، تەنانەت لە کۆمپیوتەریش گرنگترە، چونکە شتێکە پەیوەندی پێدەکرێت، ئەو کەسەی کە لە پشتی تەلەفۆنەکەوە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەیت دەبێت باوەڕ بکات کە ئێوە بیروهۆشتان لای گفتوگۆکەی ئەوە، لە کاتی قسەکردن دوورکەونەوە لە خواردن.

٧- بەرنامەڕێژو ڕێك بن: لە کاتی کارکردندا ڕێكو بەرنامە ڕێژبن، هەنگاو بە هەنگاو هەموو بەشەکان بە تێڕوانینێکی باشەوە بپەڕێنن. هەمیشە بۆ کارەکانتان بەرنامە ڕێژیتان هەبێت، ئەگەر بەشێك لە کارەکانتان لە چاونەگرن ئەوا بێگومان کارەکەتان بە ئامانج ناگات.

٨- ڕەخنەگربن: بەشێك لە خەڵکی بۆ ئەوە دەژین ڕەخنە بگرن لە بەشێکی ژیان، ئێوە ئاوا مەبن ئەگەر نارێکییەکتان لە کاروباری کەسێکدا بینی، وەکو مامۆستایەك پێی بڵێن، گاڵتە بە کەس مەکەن، لە ڕادەبەدەر سکاڵامەکەن، کاتێك

کارێك شایستەیەتی پشتگیری بکەن.

٩- بـا ڕەوشـت و ئاکارتـان جـووان بێـت: هەوڵبدەن لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بە ڕەوشتو بەزەوق بن. خەڵکی لە کاتی هەڵسوکەوتمان لە بارەمانەوە بیر دەکەنەوە، ڕەوشتتان پاك بکەنەوە.

١٠- هەندێـك کات بەرپرسـیارییەتی کێشـەیەك بگرنـە ئەسـتۆ: مرۆڤ لـە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەدا تووشی شڵەژان دەبێت. بۆیە باشـترین ڕێگە بـۆ لە ناوبردنی ئـەم کێشـەیە ئەوەیە کە هەندێجار وا باشـە چارەسەرکردنی کێشەیەك بگرینە ئەستۆ.

١١- لـە کاتـی ڕەخنەگرتنـی خەڵکی لـە ئێوە بە باشـی ڕەفتار بکـەن: کاتێك کەسێك ڕەخنەتان لێ دەگرێت بزانن هیچ بەڵگەیەکـی پێیە، یان نا؟ ئاسـانە بڵێین کەسـەکە ئیرەیـی دەکات، بەڵام وا باشـە هەندێجـار خۆمان واببینیـن کە خەڵکی دەیبینـن. بیـر لـە ڕەخنەکانـی خەڵکی بکەینەوەو بە هۆشـداری کردەوەکانیانمان لە بەرچاو بێت.

١٢- پیشـەنگ بـن: هەمیشـە لـە کارەکانتانـدا باشـترین بـن، هەموو کات کارەکانتـان وا ئەنجـام بدەن کە بیری لێ دەکەنەوە . ئەگەر هەموو کاتێك کارەکانتان بە باشـترین شـێوە ئەنجام بدەن، دەبنە نموونە، خەڵکی وەکو پێشەنگێك پەیڕەوی ئێوە دەکەن.

١٣- ئارامگـر بـن: شـتێك بـە ناوی سـەرکەوتن لە یەك شەو، یان یەك شەوە ڕێگای سەدساڵە ڕۆیشـتن نییـە هەتـا ئەوانـەی کە بـە لای ئێوەوە لـە ناکاودا سـەرکەوتووبوون، باوەڕتـان هەبێـت کە بۆ گەیشتنیان بەم سـەرکەوتنە هەوڵێکی زۆریان داوە، زەماتێکی زۆریش هەوڵیانداوە. گەیشـتن بـە سـەرکەوتن پێویسـتی بە گوزەرانـی کاتێکی زۆر هەیە. بۆیە دەبێت ئارامگر بیـن و هەمیشـە ئامانجەکانمان لەبەر چاوبێت.

١٤- شتی نوێ فێر ببن: هەمیشە هەوڵ بدەن لە بابەتی کارەکەتاندا زانیاری زۆر بە دەسـت بێنن، زانیارییەکانی ڕۆژانە ئاگادار بن. هەمیشـە زانیارییەکانتان لە کەسـانی تـر زۆرتر بکـەن بەم جۆرە سـەرکەوتوو دەبن. ڕێگایەك بۆ گەیشـتن بە سەرکەوتن ئەنجامدانی ئەم کارەیـە. بۆیە بەم جۆرە زۆر زوو خەڵکی بە لای خۆتاندا ڕادەکێشن. ئەم جۆرەش نیشاندەری سەرکەوتنتانە.

بە هیـوای سـوودێکی زۆر بۆ هەموو زانست دۆستان.

سەرچاوە:مجلە راە زندگی.

ڕۆژێـك کوڕێکـی گەنـج دەچێتە ناو کۆمەڵێـك خەڵکەوە لە ناوەڕاسـتی شـار، ناسـراو دەبێت بە خاوەنی جوانترین دڵ، لـە ناو ئەو هەمـوو خەڵکـەدا خەڵکێکی زۆر لـە دەوری گەنجەکـە ڕاوەسـتاون جەختیـان لەسـەر دڵـی بـێ عەیبو بێ کەموکـوڕی گەنجەکـە کـردەوە، کە هیچ ئاساری برینو لە کـەی پێوە دیار نەبوو. بۆیە هەموویان بـە یەك دەنگ وتیان کە دڵـی گەنجەکە جوانترین دڵەو تا ئێسـتا دڵێکی لەو شێوەیان نەبینیوە لە جوانیدا، بۆیـە کـوڕە گەنجەکـەش خۆی بـە دڵی گەورە دەکردو زیاتر بەشـانو باڵی خۆیدا دەگوت. لە ناکاو پیرەمێردێك هاتە پێشو گوتی: (بـەڵام دڵی تۆ بە ئەنـدازەی دڵی مـن جوان نییـە)! خەڵکەکـەو گەنجەکە تەماشـای دڵـی پیرەمێردەکەیـان کـرد، لێدانەکانی دڵی ئاسـایی بـوون، بەڵام پڕ بوو لە برینو پارچە پارچەبوون، دیاربوو کـە پارچەیان لێ کردبـووەوەو لە جیاتی پارچەیەکـی تـر لـێ دراوە، پارچـەکان لەسـەر یەك لێ درابـوون، هەندێك جێ خاڵی بوو هەندێك جێ قوڵی لێ دیاربوو. خەڵکەکە بە جارێك سـەریان سوڕما بوو، لەوەی کە چۆن پیرەمێرد ناسـراو دەبێت بە جوانترین دڵ. گەنجەکە تەماشای دڵی پیرەمێردەکـەی کـردو بـە پێکەنینەوە گوتی: (گاڵتـە دەکەیت پیرەمێرد! تۆ دڵی خۆت لەگـەڵ دڵی من بەراورد دەکەیت؟!) دڵـی مـن بـێ عەیـبو کەموکورییە، لە کاتێکـدا دڵی تۆ پڕە لە کونو برینو کۆن بـوون. پیرەمێرد گوتـی: بەڵێ دڵی تۆ لە ڕووکەشـدا جوانو بێ عەیبە، بەڵام هیچ کات ئامادە نیم دڵی خۆم بگۆڕمەوە لەگەڵ دڵـی تۆ، چونکە هەر برینێك کە دەیبینی نیشـانەی کەسـێکە کە من خۆشەویستی خـۆم پـێ داوە. من یـەك پارچە لە دڵی خۆم لێ دەکەمەوەو پێشکەش بە کەسێکی دەکەم کە خۆشـم دەوێت، ئەو کەسـەش پارچەیـەك لـە دڵی خۆی بـە من دەدات لە جێگای ئەو پارچەیە دایدەنێم کە پێم داوە، بـەڵام چونکـە پارچەکان یەکسـان نیـن بۆیە شـێوەی دڵم وا نارێـك دیارە. من شـانازی پێوە دەکـەم، چونکە من بە بیـری ئەو خۆشەویسـتە دەهێنێتەوە کە پارچەیەك دڵی خـۆم پێ داوە. هەندێجار پارچەیەك لە دڵی خۆم پێشکەش دەکەم، بـەڵام کەسـی بەرامبـەر پارچەیـەك لە دڵـی خۆی بە من نـادات، ئەمەش دەبێتە هۆی قووڵبوونی هەندێـك جێگە لە دڵم، هەرچەنـدە جێگای ئـەو قووڵبوونانە بە ئازارەو هەمیشـە خاڵی دەمێنێتەوە، بەڵام من بە بیـری خۆشەویسـتی دەهێنێتەوە کە بەو کەسـەم داوە کە خۆشم ویستووە. هیوادارم ڕۆژێـك ئەوانیش پارچەیەك لە دڵـی خۆیان بەمن بدەن تا دڵی خۆمی پێ داپۆشم. ئێسـتا دەبینی جوانی چ شتێکی شـاراوەیە؟! گەنجەکە بێدەنگ ڕاوەسـتاو فرمێسـك لە چاوانی هاتە خوار. پاشـان چووە نزیـك پیرەمێردەکە پارچەیەك لە دڵە جوانەکەی خۆی لێ کردەوەو پێشکەش بە پیرەمێردی کرد، پیرەمێردەکەش لێی قبووڵ کردو لـە جێگای قووڵی دڵی خۆی داینا، یەك پارچە لە دڵە بریندارەکەی لێ کردەوەو لە جێـگای پارچە لێ کراوەکەی دڵـی گەنجەکـەی داینـا. هەرچەندە دڵی گەنجەکـە وەك جاران بـێ کەموکـوڕی نەبوو، بـەڵام جوانتر لە جاران دیار بوو، چونکە خۆشەویستی کەسێکی تێدابوو کە لە ناو دڵیدا هاتووچۆی دەکرد.

با ئێمەش هەوڵ بدەین وەك پیرەمێردەکە خۆشەویسـتی خۆمـان بـۆ دەورووبەرمـان دەربڕبڕیـن، بۆئـەوەی کۆمەڵگایەکـی خۆشەویسـت بێتە کایەوە، لـە هەمان کاتدا پێویستە ڕێز لە گەورەکانی خۆمان بگرینو بە چاوی ڕێزەوە سەیریان بکەین.

# هۆکارەکانی زیرەکی

ئاشکرایە کە زیرەکی بەهرەیەکی جوانە.. هەموو کەسێك دەخوازێت زیرەك بێت.. ئارەزووی هەیە بڵێت: زیرەکم، یان هەوڵبدات ئارەزووی زیرەکی زیاد بکات.. چونکە شوێنو پایەی تاك لە ناو کۆمەڵگەدا زیاد دەکاتو لە کەسێتی تاکدا ڕۆڵی خۆی دەبینێت.. کار دەکاتە سەر ژیانیو جیاوازی دەکات.. لە ناو کۆمەڵگەکەی، کە تاکەکانی هیچ هەوڵێکیان نەداوە بۆ بەکارخستنی ئەو تواناو زیرەکییەی کە بە بێ جیاوازی دەتوانن دەستەبەری بکەنو ژیانی خۆی پێ بگۆڕێت، ئەوەندەی کە بەهێزی بازوو ماسولکەکەکانی هەوڵی بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی دەدات.. ئەوا بە مێشكو بەکارهێنانی توانای زیرەکی خۆی لە مێشکیدا بەدەستیان دەهێنێت.. لە منداڵییەوە خێزانو دەوروبەرەکەی دەیانەوێت پێشبینی بکەن بۆ ئاستی زیرەکیو تەممەڵی، یان زیتەڵەییو وریایی، یان بە پێچەوانەوە، ئەوا هەر کام لەو دوو بۆچوونەی هەیە دەیدەنە پاڵ کاتێك کە دەینێرنە بەر پرۆسەی خوێندن، ئەم جارەشیان بە جۆرێکی تر پێشبینی بۆ دەکەن. جێگەی داخە زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگە بە هۆی نەبوونی پێشینەیەکی ڕۆشنبیری، زیرەکی دەگێڕنەوە بۆ وەچەو بۆماوەیی.. چۆن دەبێت دەستەوەستان بین لەسەر ئەم دیاردە نێگەتیڤە کە هەمووی نەهامەتییە بۆ تاکەکانی ئێستەو داهاتووی دوای خۆشمان، هەندێك لە خێزانەکان دەڵێن: زیرەکی بۆ ماوەییە، بۆیە منداڵو نەوەی ئێمە یاوەری نەبووە. ئەمەش نەهامەتییەکی تری بەردەم توانای گەشەی زیرەکی قوتابییەکەیەو مێشکی قوتابییەکەش بەم شتە بێمانایەنەوە پڕدەکرێتەوە.. داهاتوویەکی تاسەر ئێسقان لە بێهیوایی بۆ تاکەکانی کۆمەڵگەو خێزانەکەیان فەراهەم دەهێنن.. دەبێتە هۆی کارەسات بۆ براو خوشکەکانی دوای خۆی. ئەمەش دەبێتە هۆی دواخستنی کۆمەڵگە.. بۆیە ئەم دیاردەیە شایەنی چەندین توێژینەوەیەو لێکۆڵینەوەیەکی زۆری پێویستە لە لایەن تاكو دەسەڵاتو ڕێکخراوەکانەوە بێت..

لەسەر گەشەکردنی زیرەکی، سێ بۆچوون هەیە:

یەکەم/ پێیان وایە.... بۆ چارەسەرکردنی زیرەکی پێویستە پشت بە توێژینەوەی زانستی ببەسترێت.. دواتر بەهێزو پێوەربێت نەك بە ڕای زۆرینە.

دووەم دەڵێت: زیرەکی بۆ هەلومەرجی ژینگەیی دەگەڕێتەوە. زۆربەی توێژەوان باوەڕیان وایە جۆری پەروەردەکردنی زانستییانەو ڕەخساندنی هەل.. کاریگەریی ئیجابی دەبێت لەسەر گەشەکردنی توانای زیرەکی.

سێیەم دەڵێت: باوەڕیان وایە زیرەکی بەهرەیەکی کاریگەرە بۆماوەو ژینگە دەیهێنێتە ئاراوە.. بۆیە با تاكو کۆمەڵگەکەمان، بە گشت لایەنەکانی ئەم دیاردەیە هەستینو زیرەکی بە ڕاهینانو پەروەردەکردنی زانستییانەوە ببەستینەوە، نەك بە بۆماوەییەوە گرێی بدەین.. بۆیە کەس لەو بەخشینەی خودا بێبەش نییە.. بەڵام بێبەشین لە خۆ ڕاهێنانو گەشەکردنی زیرەکیمان.

ئا: هۆشمەند صادق

پاییز ساڵح

# پابەندبوون بە دابونەریتەوە

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە ئەمڕۆ بە هۆی گلۆبالیزەیشن (جیهانگیری)یەوە زۆربەی نەتەوەو گەلانی جیهان تێکەڵ بە یەکتری بوون لە زۆربەی زۆری لایەنەکانەوە، ئەمەش وای کردووە کە ئینتیماو پابەندبوون بە کلتورو نەریتەکان بە باش‌وخراپییەکانییەوە بەرەو لاوازی بچێت تا ئاستێکی بەرز لە ناو گەلێك نەتەوەو وڵاتانی دونیادا. ئەمە ڕاستییەکە کە ناتوانرێت نکوڵی لێبکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ لەم ڕاستییە ناگۆڕێت کە هەموو نەتەوەیەك لە بنەمادا خاوەنی دابو نەریتو کلتورێکی تایبەت بە خۆیەتی کە جیاوازە لە هی میللەتو نەتەوەکانی تر، هەروەها پێویستە ئاماژە بە ئەوەش بکەین کە لە ناو کۆمەڵگای زۆرێك لە نەتەوەکانیشدا کۆمەڵێك دابونەریتو یاسای بنەماڵەییو خێڵەکی هەیە، کە جیاوازە لە هی بنەماڵەو خێڵێکی تر، ئەم سیفاتانەش بە گشتی لە ناو وڵاتانو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە دی دەکرێت، بۆ نموونەش لە هەرێمی کوردستاندا. دەتوانین بێژین زۆرێك لەم دابونەریتانە زۆر جوانن‌و پێویستە بەردەوامییان پێبدەین و هەوڵی گەشەکردنیشیان بدەین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەندێك نەریت هەیە کە بە داخەوە زۆر خراپو ناشیرنن‌و کاریگەری نێگەتیڤیان هەیە لەسەر بەختەوەریو ڕۆشنبیری کۆمەڵگە. لێرەوە پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەمەیە، ئایا پێویستە هەر کلتورو نەریتێك کە هی نەتەوەکەمان، یاخود هی بنەماڵەو خێڵەکەمان بێت پێیەوە پابەندبین‌و بەپیرۆزی بزانین؟! بەرەهایی دەڵێم نەخێر، چونکە هەندێك دابونەریتی بنەماڵەیی، یاخود خێزانی، یان نەتەوەیی هەیە، بۆ نموونە وەکو (خەتەنەکردنی کچان- ژن بە ژن- دەمارگیری بنەماڵەییو عەشایەری- فالگرتنەوەو... هتد) ئەم جۆرە نەریتانە نەك هەر پێویست ناکات پێیانەوە پابەندبین‌و بەردەوامیان پێبدەین، بەڵکو پێویستە لەسەرمان هەوڵی لە ناوبردنییان بدەین، چونکە هیچ بنەمایەکی لۆجیکییو ڕووناکبیرییان تێدا نییەو پێچەوانەی یاسا ئاسمانییەکان و مرۆڤایەتیشن! ڕاستە یاخیبوون و بەگژداچوونەوەی هەندێك لەم کلتورانە هەندێك پێویستی بە لە خۆبوردەییو ماندوبوون‌و قوربانیدانە، وەلێ هەرچۆنێك بێت ئێمە دەبێت تا ئەو جێگایە ئینتیمامان بۆ نەریتەکان هەبێتو جێبەجێیان بکەین کە لە ئینتیمابوونمان بۆ مرۆڤایەتی کەم نەکاتەوە، چەندان کەسی بە تواناو لێهاتووی وڵاتەکەمان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم کلتورانەو پاراستنی ویژدانی مرۆڤانەی خۆیان‌و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەکەمان قوربانییان بە خۆیان داوە لە ڕووی (کۆمەڵایەتی- ئابوری- سیاسی)ەوە بەم کارەشیان توانیویانە تا ئاستێکی باش گۆڕانکاری پۆزەتیڤانە بکەن لە کۆمەڵگەدا بە بەراورد بە چەند ساڵێکی ڕابردوو، دەبا ئێمەش هەستی مرۆڤانەی خۆمان بە کاربێنین‌و شانبەشانی ئەوان خەباتو چالاکی بکەین بۆ بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی کراوەو ڕۆشنبیر. لە هەمان کاتیشدا گرنگە ئاماژە بەم نەریتە باشانەش بدەین کە نەتەوەکەمانی زیاتر پێ جوان‌و ناسراو بووە، بۆ نموونە (میوانیو میوانداری- جل‌وبەرگی کوردی- ئینتیما بۆ نیشتیمان... هتد) کە هەبوونیان جێگەی خۆشحاڵیمانن پابەندبوونمان پێیانەوە جوانیو ژیری دەبەخشێت بە کۆمەڵگەکەمان. هەروەك سەرەتاش ئاماژەم پێدا کە بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەم کلتورونەریتانە لەم چەرخەی ئێستادا بەرەو لاوازی دەچن بە نەریتە خراپ و باشەکانیشەوە! بەڵام جێگەی دڵ خۆشیمانە کە زۆریك لە نەریتە خراپەکان بە تەواوی بەرەو لە ناوچوون دەچن بە بەراورد بە ڕابردوویەکی نزیك، ئەمەش هیوای ئەوەمان پێدەبەخشێت کە کۆمەڵگەکەمان بەرەو کۆمەڵگەیەکی مەدەنیو ڕۆشنبیری دەچێت بە شێوەیەکی خێرا. وەلێ ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە نەریتە باشەکانیش تووشی هەمان دەردی دابونەریتە خراپەکان بوون، پابەندبوونی کۆمەڵگە پێیانەوە بەرەو ساردیو لاوازی دەچێت! لە کۆتاییدا دەمەوێت زۆرجەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە ئەرکی سەرشانی هەر مرۆڤێکی ڕۆشنبیرو تێگەیشتووە کە پابەند نەبێت بە دابونەریتە نەرێنییەکان جا لە ژێر هەر فشارو پاساوێکدا بێت، لە هەمان کاتیشدا خۆشەویستیو دڵسۆزی بۆ نەریتە ئەرێنییەکان هەبێتو هەوڵی بەردەوامیو زیاتر فراوانبوونیان بدات.

# بۆچارەسەری کێشەکان با هاوکاری یەکتر بین

ئا: پێگەرد فارس

ژنو مێردێکی بە تەمەن بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانیان ڕۆژانە سەرقاڵی خزمەتکردنی کێلگەکەیان بوون، مشکێکیش لە ناو کێلگەکەیاندا دەژیا، کە بە هۆی ئەوەی بەرووبوومەکانیانی دەخوارد زۆر نارەحەت بوون، چونکە ماندوویەتی زۆریان دەکێشا لە خزمەتکردنی کێلگەکەدا، بۆیە بیریان لەوە کردەوە کە چارەیەك بدۆزنەوە، ئەویش بریتی بوو لە دانانی تەڵەیەك، کاتێك مشکەکە تەڵەکەی بینی لە ناو سندوقێك دەریان هێنا دەستی کردە هاوارو گازندە کردن، هەروەك شێتی لێهاتو بە دەوری کێلگەکەدا دەسوڕایەوەو هاواری دەکرد، تەڵەی مشکیان هێناوە... تەڵەی مشکیان هێناوە.... مریشکی خاوەن ماڵ بە هاتو هاواری مشکەکە بێزاربوو پێی وت: بە دەنگە دەنگو هاوارکردن بێزارمان مەکە، ئەو تەڵەیە تەنها بۆ تۆ دادەنرێت، ئەوە کێشەی خۆتەو پەیوەندی بە منەوە نییە... پاشان پەنای بردە بەر مەڕی خاوەن کێلگەکەو پێی گوت: ئاگاداربە.... ئاگاداربە... تەڵەیان داناوە بۆمان!

مەڕەکەش دەستی کرد بە پێکەنینو وتی: ئەی ترسنۆك، ئەگەر ئەوەندە لە سزا دەترسیت، بۆچی بەرووبوومی کێلگەکە دەخۆیتو تێکیان دەدەیت؟ پاشان مەبەستەکە تۆی نەك ئێمە بۆیە سەرمان مەیەشێنە بڕۆ وازمان لێ بهێنە... ئامۆژگاریت دەکەم واز لە دزینی خواردنو خواردنی دارو گوریسو پچڕاندنی بهێنیت.... لێرەدا مشکەکە هیچی بۆ نەمایەوەو لە مانگاش یارمەتی دەستنەکەوت، چونکە ئەویش بە گاڵتە پێکردنەوە بە دەنگێکی هێواش وتی: دیارە دەیانەوێت مانگاکان لە ناو بەرن!! چی دەڵێی داوای ئەوە بکەم لە باخچەیەکی ئاژەڵان جێگەم بکەنەوە؟!

پاش ئەوەی کە بۆی دەرکەوت هیچ کەسێك گرنگی پێ نادات بڕیاری دا خۆی خەمێکی خۆی بخوات، بەردەوام چاودێری خاوەن کێلگەکەی دەکرد هەتا شوێنی تەڵەکەی دۆزییەوەو بڕیاری دا خۆی بە دوور بگرێت لێیو بێ ترسو دوو دڵی دەخەوت... شەوێك گوێی لە دەنگێك بوو ئەویش دەنگی تەڵەکە بوو نێچیرێکی گرتبوو! یەکسەر بەرەو شوێنی دەنگەکە ڕای کرد بینی مارێکی گرتووە، خێزانی خاوەن کێلگەکەش وای زانی مشکەکەی گرتووە لەبەرئەوەی تاریکبوو نەیبینی تا مارەکە پێوەی داو زۆر ئازاری دا. بەخێرایی بەرەو نەخۆشخانەیان بردو فریاگوزاری سەرەتایی بۆ ئەنجامدراو گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام بە هۆی بەرزی پلەی گەرمی لەشییەوە دەیناڵاند... هاوسەرەکەی بڕیاری دا شۆربایەکی بۆ ئامادە بکات بۆ ئەو مەبەستە مریشکەکەی سەربڕیو بۆی لێنا!

خزمو دۆستانیش ڕۆژانە سەردانیان دەکرد هەرلەبەرئەوە مەڕەکەشیان سەربڕی بۆ میوانەکان! بەڵام نەخۆشەکە بە هۆی زیاتر بڵاوبوونەوەی ژەهری مارەکە بە ناو لەشیدا کۆچی دوایی کرد!!

بۆئەوەی خواردنی پرسەکەش ئامادە بکەن ناچار بوون مانگاکەش بکەنە قوربانی! بەو شێوەیە تەنها یەکێك لە ئاژەڵەکان کە بە زیندوویی مایەوە ئەو مشکە بوو کە مەبەستیان لە ناوبردنی بوو، تەنها ئەویش بوو هەستی بە مەترسی دەکرد، بەڵام ئەوانی تر هەستیان بە دووری کرد لە مەترسی نەمانیان، بەڵکو بە گاڵتەجاڕیشەوە لە ترسو دوودڵی مشکەکەیان دەڕوانی...

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت تەنانەت ئەگەر کێشەیەکیش ڕووبدات پەیوەندی بە ئێمەوە نەبێتو لێمان دووربێت باش وایە ئەگەر توانای یارمەتیشمان نەبوو با بێ نرخ نەڕوانینە بارودۆخو هەستیان، چونکە لەوانەیە ئەنجامەکەی زیانمان پێ بگەیەنێت، بۆیە پێویستە ئەگەر کەسێك، هاوڕێیەك، کێشەیەك، یان پێوسیتییەکی هەبوو بە جۆرێك هاوکاری بکەین، وەك ئەوەی خۆمان خاوەن کێشەکە بین.

راهێنانی

# مێشك

**بە وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو**
**هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرە كار**
**بزانە چی دەبینیت؟ تا چ رادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟**

خێزانی بەختەوەر

پەری شێخ کەریم

# جادووی حەلاڵ لە نێوان هاوسەراندا

سەرەتا پیرۆزبایی جەژنی قوربان ئاراستەی خوێنەرانی گۆڤاری بڕیاردەکەم هیوادارم هەموو ڕۆژێکتان جەژنو شادی بێت.

چۆن لە وشەی جادوو بگەین؟

ئایا هاوسەران بەچ شێوەیەك جادوو لە یەکتری بکەن؟

وشەی جادوو لە نێوان تێگەیشتنی کەسانی لێزانو نەزاندا!

وەك دەزانین وشەی جادوو لە نێو خەڵکیدا تەنها بە مەبەستی چوونە لای کەسێکی جادووگەرە بە کردنی جادوویەك، یا بە خوێندنەوەی فنجانێك کە شتێکی نامۆیەو دروست نییە، تەنها کەسانی نەزان ڕوودەکەنە ئەم کارە، ڕێژەیەکی زۆری ئەو کەسانەی کە زیاتر پشت بەم کارە دەبەستن کەسانێکن بۆ چارەسەرکردنی کێشە خێزانییەکان بە تایبەتی ئافرەتان، یا بۆ ڕێکخستنی نێوانیان لەگەڵ هاوسەرەکەیاندا، یا بۆ هەر کارێکی دیکە، پەنا بۆ ئەم کارە دەبەن، بەڵام ئەو ڕێگایانەی کە لە دەستی خۆیدایەو لە توانایدا جێبەجێیان ناکات.

بەڵام جادوو بە مانای زیرەکیو ڕەوانبێژیو زمانشیرینییە لە کاتی قسەکردندا هەتا دڵی بەرامبەر بگۆڕێت، هەروەك پێغەمبەری ئازیز (دروودی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: (إن من البيان لسحرا). واتە: (هەر بە ڕاستی بڕێك دەربڕین جادووە)، کاتێك خێزانێك زیرەکی لە ئاخاوتندا دەنوێنێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەو شێوازی قسەکردنەی کاردەکاتە سەر دڵو دەروونی هاوسەرەکەی بە هەمان شێوەش شێوازی جوانی هاوسەر لەگەڵ خێزانەکەیدا.

ئەم شێوازە پێی دەوترێت: «جادووی حەلاڵ» واتە: هاوسەران خۆیان بە زیرەکیو ئارەزووی خۆیان ژیانیان خۆشبەخت دەکەن، هەوڵدەدەن قسەوو کردەوەکانیان جوان بێت.

ڕەفتارجوانیو ڕێکوپێکی لە نێوان هاوسەراندا کارێکی پێویستەو جوانیو ڕەنگینی هاوسەران دەردەخات.

خۆ ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین جوانی دەکرێت بە دوو بەشەوە: جوانی دیار، ئەوەیە کە کەسێك کە جوانییەکەی ئاشکرایە لە شێوەو ڕووکەشداو هەستپێکراوە بۆیە پێی دەوترێت جوانی دیار.

جوانی نادیار: ئەوەیە جوانی کەسەکە نادیارە لە هەستو سۆزیدایە، واتە: لە ناخیدایە، دەرناکەوێت هەتا تێکەڵاویو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دروست نەبێت.

لێرەدا دەتوانین بڵێین: هەردوو جوانییەکە دەگەڕێتەوە بۆ زەوقبەرزی، واتە: ئارەزووجوانی ئەو کەسە، کە بەزانینی ئەم شێوازە جۆرەکانی جوانی جوانتر دەبێت، لەوانەیە زۆرجار جوانی دیار، نادیار جوانتر بکات، یا بە پێچەوانەوە.

زەوقجوانیش دەکرێت بە دووبەشەوە:

جۆری یەکەم: زەوق جوانی دیار، واتە: هەموو ئەو شتانەی پەیوەندی هەیە بە شێوەی نوێکاری لە ڕووکەشدا وەك: چۆنییەتی قژداهێنانو ڕێكوپێکی لە جل و بەرگداو بۆنخۆشکردن بە شێوەیەك کە هەستی هاوسەرەکەی، یا پیاو هەستی خێزانەکەی ڕابکێشێت. ئەو شتانەی هەردوولا بۆ یەکتری دەزانن شتێك کە زۆر بە لایەوە گرنگو خۆش بێت. نموونەشمان بۆ ئەمە هەندێك کەس زۆر جوانن لە شێوەدا، بەڵام بە هۆی نەزانین لە ڕێکخستنی شێوەو جلوبەرگدا وادەکات جوانییەکەی دەشارێتەوە، بە پێچەوانەوە هەیە زۆر ناشیرینە، بەڵام زەوقجوانی لە ڕێکخستنی شێوەو جلو

بەرگیدا ناشرینییەکەی دەشارێتەوە. بۆیە زەوقجوانیو زیاتر شارەزابوون کارێکی زۆر پێویستە لە نێوان هاوسەرانداو جادوویەکی سەرکەوتووەو زۆرجار دەبیستین چەندەها خێزان هەیە ئەو خۆشەویستیو بایەخدانی سەرەتاییەی جارانیان نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێزنەگرتنی هەستو خۆشییەکانی یەکتری، یا ئەوەتا بە هۆی سەرقاڵییەوە، یا بە هۆی بایەخنەدانەوەیە، ڕەنگە زۆرجار بگەڕێت بە شوێن چاکبوونو گەڕانەوەو باردۆخی سەرەتایی هاوسەرییان بە باسکردنی لەلای کەسێك، یا بە چەندەها شێواز، بەڵام بەداخەوە ناگەڕێت بە شوێن ئاسانترین چارەسەردا کە لە دەستی خۆیدایە.

لە ڕاستیدا کاتێك هاوسەر سەیری خێزانەکەی دەکات، یا بە پێچەوانە دەبینێت شێوەیەکی جوانو پاکوخاوێنی هەیە نامەیەکی هەست پێکراوی بێدەنگ ئاڕاستەی یەکتری دەکەن ئەگەر شێوەکە جوان بێت ئەوە ڕەزامەندی دەردەخەن بە هەڵسوکەوتێك ئەگەرنا ئەوە بێدەنگییەك دروست دەبێت کە نیشانەیە لەسەر ناڕەزایی.

بەتایبەتی هەڵبژاردنی خێزان بۆ ڕەنگو شێوەی جلوبەرگ نیشانەی زەوق جوانییە، پێویستە ڕەنگێك هەڵبژێرێت کە لەگەڵ پێستو تەمەنو شێوەی ئەو کەسەدا بگونجێتو پێویستە بایەخ بدرێت بە جلی ماڵەوە، بە داخەوە زۆرێك لە هاوسەران گلەیی لە خێزانەکانیان دەکەن بەوەی تەنها بایەخ دەدەن بە جلوبەرگو خۆڕازاندنەوەیان تەنها بۆ دەرەوە، بەڵام بەجلێکی ناشیرینەوە پێشوازیمان لێدەکەن، لە هەمان کاتدا پێویستە لەسەر هاوسەر بایەخ بدات بە جلوبەرگو بۆنخۆشکردن، هەروەك ئیبن عەباس دەفەرموێت: ((سوێند بەخوا حەزدەکەم خۆم بڕازێنمەوە بۆ خێزانەکەم، هەروەك چۆن حەزدەکەم ئەو خۆی بۆ من بڕازێنێتەوە)، لە ڕوویەکی ترەوە بایەخدان بە خۆڕازاندنەوە، یا پاكو خاوێنی)، دەروونناسەکان سەلماندویانە کە کاریگەری باشی هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەو لەبیرچوونەوەی هەموو ناکۆکییەك، بۆیە بە جادوویەکی حەڵاڵ دادەنرێت کاتێك هاوسەران بیانەوێت.

بۆ نموونە: کاتێك تووشی ناخۆشییەك دەبن، هاوسەرەکە بە توڕەیی دەچێتە دەرەوە، پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە خێزانەکەی خۆی ڕازاندووەتەوە، یا جوانکاریو پاکوخاوێنی کردووە لە ماڵەکەیدا، لەم کاتەدا خێزانەکەی نامەیەکی بێدەنگی ئاڕاستەی هاوسەرەکەی کردووە، ئەویش لە بیرچوونەوەی کێشەو ناکۆکییەو بەهەمان شێوە هاوسەریش هەست بەو شێوازە جوانو دەست ڕەنگینییەی خێزانەکەی دەکات.

زەوقجوانی نادیار: ئەم جۆرە شتێکی شاراوەیە لە ڕووکەشی هاوسەراندا دەرناکەوێت، بەڵکو لەناخیاندایە، بەڵام کاتێك حەز بە جێبەجێکردنی کارو کردەوەیەك دەکەن لە پێناو یەکتریدا، ئەو هەڵسوکەوتە نادیارانە دەردەکەون، جادوویەکی حەڵاڵیان کردووەو سیمایەکی جوانیان بەخشیوە بە ژیانیان. ئەمەش دەکرێت بە سێ بەشەوە:

یەکەم: قسەو هەڵسوکەوتی باش: ئەم جۆرە زەوقی نادیاری پێدەوترێت، چونکە هاوسەران قسەو هەڵسوکەوتێك لە پێناو یەکتریدا ئەنجام دەدەن، ئەو کاتە کردەوەی باشیان دەردەکەوێت، پرسیار کرا لە ئافرەتێك کاتێك تووشی شەڕوناکۆکی دەبیت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا، چۆن چارەسەری دەکەیت؟ لە وەڵامدا وتی: هەرچەندە کێشەکە ئاڵۆز بێت دەتوانم بە قسەو هەڵسوکەوتێك بیگۆڕمو ئەم شێوازی چارەسەرە بە جادووی حەڵاڵ دەزانم، هەوڵدەدەم ئەو کێشەیە کار نەکاتە سەر پەیوەندی نێوانمان، یان هەڵسوکەوتێك ناکەم زیاتر توڕە بێت، کارێك ئەنجام دەدەم کە نیشانەی ڕەزامەندی ئەو بێت، چونکە بە ڕاستی ڕازی بوونی ئەوم زۆر بەلاوە گرنگە، هەموو هاوسەران کلیلی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ کردنەوەی دڵو دەروونیان). ڕازی بوونیان لە یەکتری بە لێزانینو هەڵبژاردنی وتەو کرداری جوان دەبێت، هەروەك پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (هیچ شتێك نییە تەرازووی مرۆڤی موسوڵمان قورس بکات، جگە لە ڕەوشتی جوان نەبێت، خوای گەورە مرۆڤی ڕەوشت ناشیرینی خۆش ناوێت).

چەندەها بەلگەمان هەیە کە دەیسەلمێنن کە قسەو کردەوەی چاك بنەمایەکی سەرەکییە بۆ ڕێکخستنی تاکەکانی کۆمەڵگە، بەتایبەتیش بۆ پەیوەندییە خێزانییەکان.

دووەم: دەرخستنی خۆشیو خۆشحاڵی جۆرێکە لە جادووی حەڵاڵ، کاتێك هاوسەران ڕووخۆشن بەرامبەر یەکتری، یا خۆشحاڵن هەست بە خۆشبەختی دەکەن، بەتایبەتی ئەو ڕووخۆشییەی کە لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت، کاتێك بە یەکتری دەڵێن: خۆشحاڵم بە بوونی تۆ، یا خۆم بە خۆشبەخت دەزانم لەگەڵ تۆدام، یاخود هەر وتەیەك کە کاریگەری هەبێت بۆ سەر دڵو دەروون، دەروونناسەکان ڕوونیان کردووەتەوە ڕووخۆشیو ئاسودەیی دەروونی لە نێوان هاوسەراندا کاریگەرییەکی زۆر بۆ تووش نەبوون بە نەخۆشییەکانی دڵەوە هەیە، دکتۆر عەبدولحەمید ئەلبیلالی دەڵێت: مرۆڤی توڕەو مۆن هەمیشە خۆی تووشی ناڕەحەتی دەروونی دەکات، پاشان ژیانی نائاسوودەیی بۆ خۆی دروست دەکات، بەردەوام هەست بە ناڕەحەتیو بێزاری دەکات، ناتوانێت زاڵبێت بەسەر ئەو کێشانەی دووچاری دەبێت.

سێیەم: تێگەیشتنو ئاسانکاری لە مامەڵەکردندا: تێگەیشتن لە ڕاوبۆچوونو ڕێزگرتنی ئەو شتانەی کە هەردوولا ئارەزووی دەکەن، ئەم جۆرەیان بە هەمان شێوە نادیارە لە ناخی مرۆڤدایە، بەڵام بە هۆی لێزانینی ئەو کەسەی ئارەزوو جوانی وادەکات ئەو شتانەی کە ڕاوبۆچوونی بەرامبەرەکەیەتی بڕیاری لە سەر بدات، ئەوەی کە حەزی لێناکات وازلێدەهێنێت،لەو ڕێگەوە دەتوانێت جادوویەکی حەڵاڵ بۆ خۆشحاڵی خێزانەکەی بە دەست بهێنێت.

ئەو شتانەی کە زیاتر خۆشەویستی وەفاداری دروست دەکات، هەمیشە یارمەتیدانو هاوکاری هەبێت لە نێوانیاندا، پێشکەشکردنی دیاری هەرچەندە بچوکیش بێت، یادکرنەوەی یاداشتە خۆشەکانی ڕابردوو، هەموو ئەو شتانەی کە هەردوولا دڵخۆش دەبن پێیان، لەم ڕێگایانەوە جادوویەکی حەڵاڵی سەرکەوتوویان بەرامبەری یەکتری بە جێهێناوە.

لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو هاوسەران دەخوازین.

نەرمین عومەر

# چوار کۆڵەکەی ڕێزگرتن

بەهۆی هەنگاوە خێراکانی ژیانەوە، دەبینین زۆربەی خەڵکی ڕێزگرتنیان چ بۆ خۆیان، چ بۆ کەسانی دیکە کەم بووەتەوە، بەداخەوە دارمانێکی ئاشکرا لەم لایەنەوە دەبینین. ڕەنگە یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەبێت، کە زۆر لەوانەی کەوتوونەتە ئەم داوەوە، ئەوانەن، کە خۆیان هەڵنەسەنگاندووە، یان سەرزەنشی خۆیان نەکردووە. زۆربەیان ئەو وتەیەی پێشەوای دادپەروەریان لە یاد کردووە، کە دەڵێت: (سەرزەنشتی خۆتان بکەن، پێش ئەوەی سەرزەنشتی کەسانی تر بکەن. بکێشن پێش ئەوەی بکێشرێن، ئەمڕۆ کارەو حساب نییە، سبەی حسابەو کار نامێنێت).

ڕێزگرتن گرنگترین سیفەتە لە ژیانی مرۆڤدا، هەمیشە ئەو سەرچاوە سەرەکییە دەبێت، کە هەموو شتێکی باشی لێوە هەڵدەقوڵێت، دەرخستنی ئەم سیفەتە جوانە واتە ڕێزگرتن، تاکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێمە ئەم سیفەتەمان هەیە، لێرەدا چوار لە کۆڵەکە گرنگەکانی ڕێزگرتن دەخەینەڕوو:

## یەکەم: ڕەفتار

ڕەفتاری جوان، ڕەوشتێکی جوانو خۆشەویستە. ڕەفتاری جوان ڕێزگرتنە، ئەدەبو چاکەو میهرەبانییو زۆر لە کردەوە باشەکانە. هەموو کات بە ڕەفتارەکانمان دەناسرێینەوە، کە مامەڵەی خەڵکی پێدەکەین، ئەدمۆند بیرك دەڵێت: (ڕەفتار لە یاسا گرنگترە)). بەرناردشۆ دەڵێت: (کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، بێ ڕەفتاری باشوجوان، قێزەونو نەویستراو دەبێت). یەکێکیش لە فەیلەسوفە دێرینەکان دەڵێت: (وشەی نەرمونیان هەمیشە لە دەمی کەسانی حەکیمەوە دێتە دەرەوە).

کەواتە دەبێت بزانین، کە ڕەفتاری باشو چاك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنمانە.

## دووەم: زمان

ئایا ئەو قسەیە ڕاستە، کە دەڵێت: وشە کاتێك دەرتبڕی ئێتر دەمرێت؟!

ئێمە لێرەدا لەو قسەیە لادەدەین، چونکە زمانی دواندن لە نێوان خەڵکدا زۆر بە نرخو گرنگە، هەر کاتێك زمانی قسەکردن وشكو نێگەتیڤو لادەر بوو، ئەوا قبوڵکردنی کارێکی گران دەبێت. پێچەوانەکەشی ڕاستە، پێغەمبەری سەروەرمان (درودی خوای لەسەربێت) داوای لێکردووین، کە لە هەمووشتێکدا نەرمونیان بین، واتە لە کاردا بێت، یان لە قسەکردن، تەنانەت لە گومانبردنیشدا.. یەکێك لە ڕێگاکانی بەدەستخستنی خەڵکی قسەو گوفتاری جوانو چاکە، وتراوە، کە قسەکانی مرۆڤ هەمیشە گوزارشت لەوە دەکەن، کە لە دڵیدایە، هەروەها کەسانی چاك ئەوانەن، کە زۆر هەستیارن بەرامبەر هەڵبژاردنی ئەو وشانەی دەریاندەبڕن.

## سێیەم: ڕێزگرتن لە یاساکان

خوێنەری بەڕێز تەنها ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت، ئەگەر ڕێگاو بانەکان بێ ترافیك لایت بن، یان خەڵکی ئەوە نەزانن، کە نیشانەی سور واتای وەستانەو نیشانەی سەوز واتای ڕۆشتنە... چی ڕوودەدات؟ بێنە بەرچاوی خۆت، یارییەکی تۆپی پێ بەبێ هیچ یاسایەك، چی ڕوودەدات؟ ئایا شوێنەکە نابێتە گەڕەلاوژێو بەدڵنیاییش کۆتایی یارییەکە بە ناخۆشییو ئازاردان دەبێت، یەکێك لە نیعمەتەکانی خوای گەورە کە بە مرۆڤی بەخشیوە، نیعمەتی دینە، دینیش یەکێکە لە گرنگترین ئەو لایەنانەی کە بانگەوازی خەڵك دەکات بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان.

## چوارەم: هەستپێکردنو بە هەندوەرگرتنی جیاوازییەکان

ڕەنگە لەبەر ئەوەی ئێمە زۆرکات ڕاستیو دیدی سنووردارمان بۆ ڕاستیی تێکەڵاو دەکەین، بۆیە ناتوانین ڕێز لە جیاوازییەکانی نێوانمان بگرین، بۆچی ئەوەی ئێمە دەیڵێین باشەو ئەوەی کەسانی تر تیایدا لەگەڵماندا جیاوازن، خراپە؟ بۆچی زۆر کەس ئەو بۆچوونە هەڵەیە پیادەدەکەن، کە دەڵێت: (ئەوەی لەگەڵ من نەبێت، ئەوا دژمە)، ئایا ئەمە دیدێکی کورتبینانەو خۆپەرستانە نییە؟ بۆچی ئەم خۆپەرستییە لە مامەڵەکردنماندا هەبێت؟ کوا خووڕەشتی چاکەکاران؟ زانایەك دەڵێت: (مشتومڕم لەگەڵ هەر کەس کردووە، هیوام ئەوە بووە، کە هەق بە ئەو بێت)، کێ دەگاتە ئەم دەروونە جوانە؟ تۆماس میرۆن دەڵێت: (هیچ کات ڕاستیی ڕوون نابێتەوە، مادام هەریەك لە ئێمە وای دادەنێت، کە خۆی ناوەندی گەردوونە).

# هونەری گفتوگۆو نەهێشتنی ناکۆکییەکان لە نێوان هاوسەراندا

لە فارسییەوە: بیلال باسام

هاوسەری دڵڕەنجاو هەوڵدەدات ڕەوایەتی خۆی بسەلمێنێت، لەو بڕوایەدایە کە ڕەفتارێکی نارەواو ستەمکارانەی لەگەڵدا کراوە. ئەگەر هەردوولا هەنگاوێك هەڵنەگرن بۆ نەهێشتنی لە یەکتر زیزبوونی خۆیان بەردەوام ڕێژەکەی زۆرتر دەبێتو کار بە قەڵسبوون کۆتایی دێت، لە گشت ئەو قۆناغانەی سەرەوەدا پێکەوە دیالۆگو گفتوگۆکردن دەیتوانی دەرگاکانی ئاشتی بکاتەوە، هەندێجار شەرم دەبێتە مایەی ئەوەی بۆ نەهێشتنی زویربوون هەنگاوێك هەڵنەگرین، هەندێك کات لە واقیع هەڵدێینو کێشەکە پشتگوێ دەخەین، هەندێجاریش حەزدەکەین ئەوانیتر وەك خۆمان لێ بکەین، بەڵام دەبێت واز لە خۆبەزلزانین بهێنین، دەبێت قبوڵی بکەین پەیوەندیی ڕاستو دروستو پەسەند لەسەر هەستی ڕێزگرتن لە بیروباوەڕو قسەی لایەنی بەرامبەر دامەزراوە.

بەر لە هاوسەرگیری چاوەکان باش بکەنەوەو دوای ئەوە، کەمێك چاو دابخەن. (فرانکلین).

پێویستە هاوسەرەکەت قبوڵ بکەیت بە هەمان شێوە کە هەیە، بۆئەوەی بایەخ بە داخوازییە لۆژیکییەکانت بدات، پێویستە ڕێز لە داخوازییەکانی بگریت، دەبێت بە شێوەیەکی شیاو لەگەڵی بدوێیت، ئەگەر قسەی لەگەڵ نەکەیت لە کوێوە بزانێت تۆ چ داخوازییەکت هەیە، ئەوانەی کە لەو بڕوایەدان گفتوگۆ هیچ ئاکامێکی لێناکەوێتەوە دەبێت بزانن ئاشنایەتییەکی تەواویان لەگەڵ شێوازی قسەکردندا نییە.

کاتێك لەگەڵ هاوسەرەکەت دەردی دڵت کردو گرژیو پەشێوییەکانت نەهێشت، ئەودەمە پەی بەم خاڵە دەبەین کە ئەوەی شیاوی نیگەرانیو زیزبوون بێت، هەرگیز بوونی نییە (پلاتوس).

٢- هونەری نەهێشتنی زویربوون:
لە ژیانی هاوسەریدا زیزبوون، سکاڵاو دەمەقاڵەکان زۆرو زەوەندەیە، ئەگەر وانەبێت پێویستە نیگەران بین، چونکە پەیوەندی ئەو جووتە ڕووی لە ساردی کردووە، سەبارەت بە هاوسەر بێباك دەبنو یەکتریان خۆش ناوێت، چونکە لە یەك زیز دەبن، هەر گفتوگۆیەك شێوازێکی هەیە کە ئەگەر بێتو گشت خاڵەکانی لە بەرچاو بگیرێت کۆتاییەکی خۆشی دەبێت. هەنوکە ڕێگاکانی گلەیی کردنی باش شرۆڤە دەکەین بۆ ئەوەی بتوانیت ئەم قۆناغە هەستیارە بە باشی ببڕیت..

* بەر لە قسەکردن هەوڵ بدەن خۆتان لە جێی هاوسەرەکەتان دابنێن، بەم کارە باشتر پەی بە کێشەکانی ئەو دەبەیت.

* بەرلە قسەکردن لەگەڵ هاوسەردا هیچ کاتێك بابەتەکە لای کەسانی تر مەدرکێنە، چونکە ڕەنگە قسەکانی تۆی بۆ بگێڕنەوەو لە دژی تۆ هانی بدەن.

* لە سەرەتای گفتوگۆوە دووپاتی بکەنەوە مەبەستتان لە خستنەڕووی دلگرانییەکە، نەهێشتنی بەدحاڵیبوونە، چونکە ڕق و کینەو زیزبوونی درێژخایەنو مشتومڕی بێهودە بە هیچ کوێ ناگات.

* هەوڵبدەن لە خاڵە پۆزەتیڤەکانی کارەکانی ئەم دواییەی ئەو، یاخود ئەوەی لە ئەو پەسەندت کردووە باسێك بهێنیتە ناوەوە.. تا کەشی گفتوگۆکە دۆستانە بێت.

* دووپاتی بکەنەوە ڕەنگە تاوانباری ئەم ڕووداوە خۆتان بن، هەربۆیە تەنها لە پێناو نەهێشتنی دلڕەنجانەکەدا ئەم وتووێژەتان دەستپێکردووە، ئەگەر کەموکورتییەکت هەبووە دەستبەجێ دانی پێدا بنێنو داوای لێبوردن لە هاوسەرەکەتان بکەن ئەم کارەتان کەشی گفتوگۆکە باشتر دەکاتو هاوسەرەکەتان واهەست ناکات دادگایی کردنێك لە گۆڕێدایە، ئەوەش بلێین کە ئەویش ئامادەی قبولکردنی هەڵەکانی دەبێت.

* لەگەڵ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکاندا قسەکانتان بە کینایەو توانجو سوکایەتیو گاڵتەجاری دەرمەبڕن، چونکە دۆخەکە لەوەی کە هەیە ئاڵۆزتر دەکات.

* هەرگیز هاوسەرەکەتان بە ئەوانی تر بەراورد مەکەن و تایبەتمەندییەکانی ئەوان مەکێشە بە ڕوویدا، ئەگەر دەتەوێت بەراوردێك لە کاردا بێت هەوڵبدە لەگەڵ خۆیدا بەراوردی بکەیت، واتە ئەو هەڵەیەی ئەنجامی داوە، لەگەڵ ڕەفتارێکی چاکی خۆیدا لە کاتێکی تردا بەراورد بکە.

* لە دلڕەنجانو زیزبوونە بچوکەکانەوە دەست پێبکە، باس لە ڕابردووی دوور مەکە، دوای نەهێشتنی دلڕەنجانەکە ناچاری مەکە دان بە هەڵەکەیدا بنێتو داوای لێبوردن لە ئێوە بکات ئەم مەسەلەیە غروری ناهێڵێتو ڕووداری دەکات.

* خۆت لە کەللەڕەقی بە دووربگرەو ئینکاری مەکە ئەگەر مەسەلەیەك لەو دانیشتنەدا چارە نەکرا گفتوگۆکە بخەنە دانیشتنی دوایی.

* لە کاتی گفتوگۆدا ئەگەر هاوسەرەکەتان ویستی قسەیەك بکات ڕێی لێ مەگرە، هەموو گیانت بکە بە گوێچکەو دەرفەتی بدە بۆچوونی خۆی دەرببڕێت، بەم ڕەفتارەتان دەیسەلمێنیت ئەویش خاوەن مافە، لە لایەکی دیکەوە هاوسەرەکەت بە قسەکردن لە ڕووی دەروونییەوە خاڵی دەبێتەوە کاتێك قسەکانی تەواو بوو هەست بە ئارامیو ئاسودەییەکی زۆر دەکات، لەبەرخۆشییەوە دەڵێت: منیش قسەی خۆم کرد؟ بەمجۆرە ئەگەری ئاشتیو گەیشتن بە لێکگەیشتن دەڕەخسێت.

* بە هەر شێوەیەك کە بۆتان دەلوێت بە بۆنەی نەهێشتنی دڵئازاردانەکەوە ئاهەنگێك بگێڕن (بە دیاری پێدانی چەپکە گوڵێك، یا هەرشتێکی لاوەکی کە لایەنی بەرامبەر پێویستی پێی هەبێت)، خاتوون دەتوانێت کێك، یان شیرینی دروست بکات، هاوسەریش دەتوانێت بانگهێشتی بکات بۆ شیرینی خواردنێکی عەسرانە، یا نانی ئێوارە لە دەرەوەو.. هتد.

* هەمیشە لە یادتان بێت ئاشتبوونەوە ناچارییەکان کە تێیدا هیچ کام لە دوو لایەنەکە گۆڕانێك لە خۆیاندا ئەنجام نادەن بناغەیەکی فشەڵی هەیە.

دوای ساڵێك ژیانی هاوسەرداری ئیدی ژنو مێرد بیر لە جوانی ڕووخساری یەکتر ناکەنەوە، بە پێچەوانەوە تەنها چاویان لەسەر خووڕەوشتو ڕەفتاری یەکترە! (ساموئیل اسمایلز).

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

# تەنها پارە هۆکاری کێشەکانە؟

و: محەممەد شێخ حوسەین

ئایا دەزانیت پارە چییە؟ بێگومان ئەم وشەیە ئەوەندە بڵاوو ناسراوە، پێویست بە ناساندن ناکات، بەڵام چەندان کێشەو ناڕەحەتی لەم گێتییەدا دروستبووەو هۆکارەکەی پارە بووە، لە هەمان کاتدا چەندان کێشەو ناڕەحەتی چارەسەر بووە، ئەویش هەر بە هۆی پارەوە.

بەڵام ئایا پارە ئەم هەموو کاریگەرییەی هەیە لەسەر مرۆڤ؟ ئایا هۆکارەکە تەنها پارەیە، یان شتێکی تر لە ئارادایە؟ کاتێك بیرم لەم مەسەلەیە کردەوە.. لەگەڵ دەروونی خۆمدا هاتمە ئاخاوتنو زۆر بە قوڵی بیرم کردەوەو دوور ڕۆیشتمو دوور لە پارە، دنیام هێنایە بەرچاوی خۆم، بەڵام لەگەڵ چاکەدا، لە بری ئەوەی هەموو مرۆڤێك ڕەسیدی بانکی هەبێت، با ڕەسیدی چاکەی هەبێت... بتوانێت ئاگاداری بکاتو بیپشکنێتو بزانێت چەندی هەیە.

ئایا دەتەوێت شتێك بکڕیت؟ ئەوا پێویستە چاکە بدەیت- بۆ نموونە نانێك بە ٣چاکە، یەك لیتر بەنزین پێنج چاکە، لاپتۆپێك (٣٠٠) چاکە، ئۆتۆمبیلێك (٢٠٠٠) چاکە، گەشتێك (٥٠٠) چاکە، مارەیی هاوسەرگیری (١٢٠٠) چاکە، مسقاڵی ئاڵتون (١٠٠) چاکە.... هتد.

ئێستا بیهێنە بەرچاوی خۆت دنیا چۆن دەبێت! دەبینیت هەموو کەسێك پێشبڕکێیەتی بۆ کاری چاکە، لە ماڵ دەردەچێت بە هەر کەسێك دەگەیت بە ڕووتدا پێدەکەنێتو هەواڵی خۆتو ماڵو منداڵت دەپرسێت، پێشنیار دەکات بۆ یارمەتیدانت، تەنانەت دەشیەوێت خزمەتت بکات...

ئەمە هەموو لە پێناوی ئەوەی کە زۆرترین چاکەی دەستبکەوێت. دەبینیت کە خێرو چاکە بڵاوە دەکات لە هەموو جیهاندا.. وایلێدێت هەموو خەڵکی لە سایەی هەستی برایەتیو خۆشەویستیو لێبوردندا دەژین.

ئێستا بیر لە شێوازێکی تر بکەرەوە پارە بگۆڕە بە خراپە! ساردییەکی کۆکا کۆلا ٣خراپە، هێڵێکی ئینتەرنێت مانگانە ٥٠ خراپە، دەرمانی نەخۆشی پەرکەم (٢٠) خراپە، مەڕێکی قوربانی (٥٠٠) خراپە، (٥٠) کەس بکوژەو یەکسەر دەبیت بە ملیونێر!

لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا دەبینیت کە نەمانو تیاچوون گەورەترین هەڕەشەیە بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی.

کەواتە چی گۆڕا؟؟ لە هەموو حاڵەتەکاندا ئێمە هۆکارێکمان هەیە کەبریتییە لە پارە، یان لە چاکە، یان خراپە.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە بۆ مرۆڤ گرنگ نییە هۆکارەکە چییە؟ گرنگ نییە بەرامبەر بە کاڵایەکی دیاری کراو پارە، یان چاکە، یان خراپە بدات.. بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە کاڵاکەی دەست بکەوێت!

کێشەکە لێرەدا لە چەمکی (دەسکەوتن)دایە، نەك لە چەمکی (هۆکار)دا.

گەر بە شیکردنەوەی چەمکی (دەسکەوتن) هەستاین.. بە زاراوەیەکی تر دەگەین. ئەویش (قەناعەتە)- ئایا مرۆڤ ڕازییە بەو بەشەی کە خوا بۆی دیاریکردووە؟ ئەم پرسیارە ناوەڕۆکی کێشەکەیە، مرۆڤ قەناعەت ناکاتو ڕازی نابێت بەوەی کە هەیەتیو هەردەم هەوڵی زیاترو زیاتر دەدات.

بۆ نموونە.... ئەحمەد دەیەوێت کۆمپیوتەرەکەی بگۆڕێت بە مۆدێلێکی بەرزتر.. هەرچەندە کارەکانیشی بەمەی ئێستەی جێبەجێ دەبێت.

بەهەشت دەیەوێت ئۆتۆمبێلێکی بەرزتر لەوەی ئێستەی بکڕێت.. لەبەرئەوەی کە سەهەندی دراوسێی ئۆتۆمبێلێکی بەرزترو تازەتری کڕیوە.

ڕەوا دەیەوێت هاندێکی تازە بکڕێت، چونکە هاندەکەی ئێستەی کامێرای لەسەر نییە، هەرچەندە هیچ پێویستییەکیشی بە کامێرا نییە.

لێرەدایە کێشەکە دروست دەبێت زۆربەی خەڵك ڕازی نین، بەوەی هەیانەو داوای زیاتر دەکەن.. ئەوان ئامادەن بەرامبەر بەو شتە تازەیە ببەخشن. جا بەخشینەکە پارە بێت، چاکە بێت، یان خراپە، گرنگ دەستکەوتنی ئەو شتە تازەیەیە!

لێرەدا تێبینی دەکەین کێشەکە تەنها پارە نییە.. بەڵکو کێشەکە لە مرۆڤ خۆیدایە، لە دەروون، لە عەقڵ، لە بیرکردنەوەو لە دڵیدایە!

ئەم کێشەیە لە سنور دەردەچێت، کاتێك مرۆڤ ژیان لەسەر چەمکی بە تەنها (دەسکەوت) دەست پێبکات.

لەم کاتەشدا بە چەمکێکی تازەکە دەگەین.. ئەویش چاولەدوویی.تەماعە، لێرەدا چیرۆکێك هەیە لەسەر تەماع... دەگێڕنەوە کە سێ کەس کوپەیەك زێڕیان دۆزییەوەو ڕێکەوتن کە بەشی بکەن لە نێوان خۆیاندا بە یەکسانی، بەڵام پێش دابەشکردنی، هەستیان بە برسێتی کرد.. بڕیاریاندا یەکێکیان بچێت خواردن بهێنێت، ئەو کەسەش لە گەڕانەوەیدا ژەهری کردە خواردنەکەوە بۆئەوەی زێڕەکە تەنها بۆ خۆی بمێنێتەوە، لەو لاشەوە دوو هاوڕێکەی ڕێکەوتبوون لەسەر کوشتنی لە کاتی گەڕانەوەیدا، بۆئەوەی زێڕەکە بکەن بە دوو بەشی یەکسانەوە!

کاتێك پیاوەکە گەڕایەوەو خواردنە ژەهراوییەکەی هێنایەوە، دوو هاوڕێکەی پەلاماریان داو کوشتیان، پاشان نانەکەیان خواردو هەردووکیان بە هۆی ژەهرەکەوە مردن.

ئەمە ئەوەیە کە ئەمرۆ لە جیهاندا ڕودەدات...

کوشتن، فڕاندن، غەشو زوڵم... هەموو ئەمانەش بە هۆی چاوچنۆکیو تەماعەوەیەو هەوڵدانیشە بۆ بەدەستهێنانی زیاترو زۆرتر.

پوختەی وتە ئەوەیە: پارە بەکار بهێنە بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەکانت.. تا بە سەربەرزیو کەرامەتەوە بژیت. ئەگەر لێت زیاد بوو.. ئەوا بیکە بەخێر، یان لە پرۆژەیەکی خێریدا خەرجی بکە.. تا بە هۆیەوە چاکەت دەست بکەوێت، تەنانەت بۆ دوای مردنیشت.

خەون بە دنیاوە مەبینە، خەون بە دوارۆژەوە ببینە.. پارە تەنها چەند پارچە کاغەزێکەو هیچ دەوڵەمەندییەك نابەخشێت.. بەڵکو دەوڵەمەندیی ڕاستەقینە وا لە ئاسودەیی دەروونو سەلامەتیی عەقڵو ئارامیی دڵدا.

ئەگەر یەکێك پێی وتیت: هەموو کێشەکانی جیهان بە هۆی پارەوەیە.. ئەوا تۆش پێی بڵی (نەخێر) دەستی چەپ بخەرە سەر دڵتو دەستی ڕاست بخەرە سەر سەرت. ئەگەر لێت تێنەگەیشت.. ئەوا لینکی ئەم بابەتەی پێ بدە.. تا بیخوێنێتەوە، ئەگەر وتی ئەوە چییە؟ خۆ من ئینتەرنێت بەکارناهێنم!! ئەوا بزانە ئەو کەسە لە کێشەدایە...

سەرچاوە/ مدونە رشید.

سالم ئەحمەد

# چۆن هاوسەری ژیانت هەڵدەبژێریت؟

**لەبەر گرنگی پرۆسەی هاوسەرگیری پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:**

١- هاوتایی لە ئاینو باری کۆمەڵایەتیو نزیکی لە ئاستی ڕۆشنبیریو زانستیو ئابوری، بناغەی هاوسەرگیرییە.

٢- نزیکی لە چۆنییەتی بیرکردنەوەو توانای گفتوگۆکردنی بابەتەکان، بە ڕەوانبێژیو ڕاشکاوانە.

٣- گرنگیدان بەو ئارەزووانەی کە لە هەردوولادا هەن.

٤- تەمەنی هەردوو هاوسەر لە یەکتری نزیك بێتو جیاوازی زۆریان نەبێت، بە ئەندازەیەك کە کێشە دروست بکات لە ئێستاو داهاتوودا.

٥- لە ئاکارو خوو تەقالیددا لە یەکەوە نزیك بن.

٦- هەڵبژاردنی هاوسەری ژیان، پێویستە بە عەقڵ بێت، نەك بە عاتیفەو سۆز، چونکە عاتیفەو سۆزداری وادەکات کە عەقڵو چاو پێشبینی داهاتوو نەکەن.

٧- دیارە هەر کارێك مرۆڤ پێی هەڵبسێت پێویستی بە یارمەتی خوای باڵادەست هەیە، بۆیە پێش هەر بڕیارێك لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا داوای کارئاسانی بکە لە خوای باڵادەست.

چۆن نەخشەی هاوسەرگیرییەکی بەختیارانە دادەڕێژیت؟

١- هەڵبژاردنێکی تەندروستو تەواو، بۆ هاوسەری ژیانت.

٢- پابەند بوون بە توانا کرداریو ڕاستەقینەکان، چ ماددی، یان دەرونی و مەعنەوی بن.

٣- سوودوەرگرتن لە ئەزموونی هاوڕێیانو خزمانی نزیك، تا لە هەڵەکانیان دووربیتو دووبارەیان نەکەیتەوە.

٤- ڕاشکاوی لە هەردوولا لەگەڵ یەکتریو ئاگادارکردنەوەی یەکتری لە ئاستی سەروەتو سامان بە ڕاستگۆیی.

٥- خستنە بەرچاوی عەیبو کەموکوڕی یەکتریو ئەو شتانەش کە لە یەکتری جیاوازن.

٦- پێویستە هەردوو هاوسەر پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ کەسوکاری یەکتریدا دروست بکەن.

٧- پلاندانان بۆ منداڵبوونو ڕێکخستنی ژیانی خێزانی.

٨- با مەبەست لە هاوسەرگیری ئەوە بێت کە خێزانێکی دامەزراو پێکەوە بنێت، کە خۆشەویستی باڵی بەسەردا بکێشێت و نەوەیەکی بە سوودو پاكو ڕۆشنبیر پێ بگەیەنێت، پاشان بزانە کە ژیانی هاوسەرگیری پێویستی بە هەوڵو کۆششو هاوکاریو هاوبەشی هەیە، تاوەکو سەرکەوتوو بێت، چونکە وەك پەندە کوردیەکە دەڵێت:

بێ ماڵی باشە، نەك ماڵی پڕدەنگ
با بێ پێڵاو بی، نەك پێڵاوی تەنگ

سەچاوە : کەناڵی ئاسمانی/ کیف؟

و/ درەخشان بەهادین محەممەد

# توانای چاوپۆشیکردن لە گوێزەکان

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پیاوێکی دەوڵەمەند سەبەتەیەکی گەورە پڕ لە گوێز دەکاتو بە سواری ئەسپەکەی دەیبات بۆ بازاڕی ئاواییەك، پاشان سەبەتەکە دەگرێتو بە خەڵکەکە دەڵێت: "ئەم سەبەتە گوێزە دەکەمە دیاری بۆ خەڵکی ئەم گوندە، بەڵام لە یەك ڕیزدا بووەستنو هەریەکەتان گوێزێك هەڵبگرێت. بە ئەندازەی هەمووتان گوێز هەیەو بەشی هەمووان دەکات، پیاوە دەوڵەمەندەکە ئەمەی وتو ڕۆیشت. خەڵکەکە لە دوای یەك ڕاوەستانو یەکە یەکە گوێزێکیان هەڵدەگرت، مێردمنداڵێکی زیرەکیش چووە ڕیزەکەوە، بەڵام کاتێك نۆرەی هات چووە تەنیشت سەبەتەکەو ڕاوەستاو نۆرەی خۆی دا بە کەسی دواتر، بەم جۆرە هەر کەسەو گوێزی خۆی دەبردو بە دوای کاری خۆیدا دەڕۆیشت. پیاوێك کە لای وابوو زۆر زیرەکە بە خۆی وت: "کاتێك نۆرەی من هات دوو گوێز هەڵدەگرمو هەڵدێم، لە کۆتاییدا هیچ بەم کوڕە زیرەکەکە ناگات". پیاوەکە ئەو کارەی کە داینابوو ئەنجامی داو لە نێو قەرەباڵغی خەڵکدا خۆی ون کردو هەڵهات. سەرەنجام کاتێك هەمووان بەشە گوێزی خۆیان بردو ڕۆشتن، کوڕە منداڵەکە بە بزەیەکەوە سەبەتەکەی هەڵگرتو خستییە سەرشانیو وتی: "من هەر لە سەرەتاوە گوێزم نەدەویست، ئەم سەبەتە بایەخێکی زۆرتری هەیە لە گوێزەکان". پاشان بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ماڵ بەڕێکەوت.

زۆرێك دڵیان بە گوێزو یاری گوێز خۆشەو بێ ئاگان، کە ئەوەی بە بەهاترە سەبەتەکەیە کە گوێزەکانی تێدا کۆبووەتەوە. هەر بەو چەشنەی کە زۆرێك ڕێزی خانەوادەو هاوسەرو منداڵی خۆیان نازاننو بەردەوام لەگەڵیاندا شەڕو هەرایانە. لەو خاڵە زێڕینە بێ ئاگان کە ئەو سەبەتەی ئەو تاکانەی پێکەوە کۆکردووەتەوە بە ناوی خانەوادە بە پلەبەندی بایەخی زۆرترە لە کەللەڕەقیو هەراو هۆریای تاکەکانی خێزان. هەندێکی تریش کاتێك لە کۆمپانیاو دەزگایەك کاردەکەن، هەوڵ دەدەن هەر خۆیان بە تەنیا لەبەر چاو بن، لە بەرامبەر ئەندامەکانی تری کۆمپانیاو دەزگاکەیان زوڵمیان پێ ڕەوایە، تەنها لەبەرئەوەی بەشێکی زۆرتریان دەست بکەوێت. ئەوان لەو خاڵە گرنگو هەستیارە بێ ئاگان کە تیپێك لە قاڵبی کۆمپانیادا ئەوانی لە دەوری یەك کۆکردووەتەوە، هەروەك ئەو سەبەتەیە کە گوێزەکانی هەڵگرتبوو. پاراستنی ئەو تیپو سەبەتەیە بە پلە بەهای زیاترە لە چەندانە گوێزێکی زیادە. زۆرکات لە ژیاندا گوێزەکان هێندە مرۆڤەکان بە خۆیانەوە سەرگەرم دەکەن کە تاك بێئاگا دەبێت لەوەی کە خەریکە بە هۆی پێداگری، سەرسەختی، خۆپەسەندی، تووڕەیی بێ ئەندازە، خەریکی لە دەستدانی دامودەزگاو تۆڕێکە. کاتێك لێك هەڵوەشێت هەریەکە لە تاکەکانی بە چەشنی گوێزەکان دەکەونە سەر زەوی هەریەکەیان بە لایەکدا دەڕۆنو ئەو کات بۆیان دەردەکەوێت کە ڕۆڵی سەبەتەکە لەم نێوەدا چەندە چارەنووسسازو گرنگە.

ئەو قوتابیانەی کە بە بیانووی جۆراوجۆر وانەو قوتابخانە جێ دەهێڵنو شێوازو یاسای قوتابخانە دەشێوێنن، لەو خاڵە گرنگو بەرچاوە بێ ئاگان کە بێ بوونی پۆلو بێ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە، ئیتر قوتابخانەو فێربوونی زانست بێمانا دەبێتو سەبەتەکە لە دەستچوو، هەر قوتابییەك وەك دانە گوێزێك دەڕواتە ژێر بەردێكو لە ناو دەچێت.

وەرن با لە هەر دەستەو کۆمەڵێکدا کە هەین سەبەتەو تۆڕەکە لەبەر چاو بگرینو ڕێزی لێ بگرینو نەهێڵین داوو ڕیشاڵەکانی سەبەتەکە لاوازو تەنك بێتو بپووکێتەوە، چونکە هەرکات ئەو تۆڕە ڕاگرو کۆکەرەوەیە لێکهەڵوەشا ئیتر هیچ شتێك لە جێو ڕێی خۆیدا ناوەستێتو بەشی شایستەش بە هیچ کەس ناگات. چیتر هەلە یەکسانەکان بۆ کەس ناڕەخسێت، ئارامیو بەرقەراری کە لە چوارچێوەیدا دەکرێت فەراهەم بێت دەست ناکەوێت. زۆر لە ڕاوچییە زیرەکەکانیش بە دوای سەبەتەکەوەن، نەك گوێزەکانی ناو سەبەتەکە. لەبەر ئەوە ئاگامان لە خۆمان بێت کە بێهودە خەریکی گوێزەکان نەبین تا سەرەنجام سەبەتەو کارە بنەڕەتییەکە لە دەست نەدەین.

# دەمەوێت موعجیزە بکڕم!!!

ئەسکەندەر ڕەحیم

ئەو دەمەی سارا کیژۆڵەیەکی هەشت ساڵان بوو.. گوێی لێ بوو، دایكو باوکی لە بارەی برا بچووکەکەیەوە، دەدوێن.. لە وتەکانی ئەوانەوە، ئەوە تێگەشت.. کە برا بچووکەکەی زۆر زۆر ناساغەو ئەوانیش پارەوپوڵی چارەسەرکردنی ئەویان نییە.. سەرەڕای ئەوەش، باوکی تازە ئیشو کارەکەی لە دەست دابوو.. نەیدەتوانی خەرجی ئەو نەشتەرگەرییە گرانەی براکەی بدات.. هەروەها سارا گوێی لێ بوو کە باوکی بە هێواشی بە دایکی گوت:

تەنها مەگەر بە موعجیزە کوڕەکەمان ڕزگاری بێت.

سارا بە دڵتەنگیو خەمبارییەوە، بەرەو ژووری نووستنەکەی ڕۆیشت.. لە ژێر قەرەوێڵەکەیدا، دەخیلە بچووکەکەی دەرهێنا.. دەخیلەکەی شکاند.. پارە کانی لەسەر قەرەوێڵەکە هەڵڕشتو دەستی کرد بە ژماردنیان.. هەموو پارەکەی، تەنها پێنج دۆلار بوو.

دواتر بە ئەسپایی لە دەرگای پشتەوەی ماڵەکەیان چووە دەرەوەو چەند کۆڵانێکی بڕی.. تا گەیشتە دەرمانخانەیەك.

سارای هەشت ساڵان، ماوەیەك لەبەردەم مێزی دەرمانسازەکەدا چاوەڕێی کرد.. بۆئەوەی سەری بپەرژێتە سەرئەمو پێی ڕابگات.. بەڵام دەرمانسازەکە سەری قاڵتر لەوە بوو کە ئاگای لە منداڵێکی بچووکی هەشت ساڵان بێتو بەدەمییەوە بچێت.

کیژۆڵەکە دوو سێ جار پێی بەزەویدا داو یەك لەسەر یەکیش بۆی دەکۆکی.. بەڵام دەرمانساز، هەر بۆی نەکرا، بە دەم داواکاری ئەو منداڵەوە بچێت.

سەرەنجام سارای هەشت ساڵان، ئارامیی لەبەر بڕاو دڵی بەرایی نەدا، ئەوەندە لە ڕێی دەرمانساز بووەستێت.. بۆیە پارەکانی هەڵڕشتە سەر مێزی بەردەم دەرمانسازەکە.

ئەویش ئەمەی زۆر پێ سەیر بوو.. بۆیە بە کیژۆڵەکەی گوت: فەرموو چیت دەوێت؟

کیژۆڵەکە گوتی: براکەم زۆر نەخۆشە.. دەمەوێت موعجیزە بکڕم.

دەرمانسازەکە بە سەرسوڕمانێکەوە پرسی: ببورن.. من تێنەگەیشتم چیتان گوت.. بە ئەرك نەبێت، پێم بڵێن بە تەواوەتی چیتان دەوێت؟!

کیژۆڵەکە بۆی ڕوونکردەوەو گوتی: برا بچووکەکەم زۆر نەخۆشە.. شتێك چووە بە سەریدا.. بابەگیانیشم دەڵێت: تەنهاو تەنها موعجیزە دەتوانێت ئەو ڕزگار بکات.. لەبەرئەوە من هاتووم موعجیزە بکڕم.. زەحمەت نەبێت نرخی موعجیزە چەندە؟

دەرمانسازەکە گوتی: بە داخەوە کیژۆڵە جوانەکە.. ئێمە لێرەدا موعجیزە نافرۆشین.

هەردوو چاوە جوانەکانی سارا، پڕبوون لە فرمێسکو گوتی: برا بچکۆلەکەم زۆر نەخۆشە.. بابەگیانیشم پارەی نییە، تا موعجیزەی پێ بکڕێت.. ئەمە هەموو پارەوپوڵەکانی منە.. کە لە ناو دەخیلەکەمدا بوو.. تو خودا پێم بڵێن: لە کوێ دەتوانم موعجیزە بکڕم؟

پیاوێك کە لە گۆشەیەکی دەرمانخانەکەدا ڕاوەستا بوو.. پۆشاکێکی شیكو ڕێكو پێکی لەبەردابوو.. لە کیژۆڵەکەی پرسی: چەندەت پارە هەیە؟

سارای هەشت ساڵان پارەکانی لەسەر مێزەکە هەڵگرتەوەو پیشانی پیاوەکەی دا.. پیاوەکە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

زۆر چاکە.. ئەوەندەی من بزانم.. ئەم پارەیە بەشی ئەوە دەکات، موعجیزە بۆ براکەت بکڕیت!!!

پاشان پیاوەکە بە نەرمی دەستی سارای گرتو گوتی: من دەمەوێت براکەتو دایكو باوکت ببینم.. وا بیر دەکەمەوە، موعجیزەی برا بچکۆلەکەت لە لای من دەست بکەوێت.

ئەو پیاوە لە شیکاگۆدا، بەناوبانگترینو شارەزاترین پزیشکی مێشكو دەمار بوو.. دکتۆر: ئارمسترۆنگ بوو.

بۆ سبەی نەشتەرگەری بۆ سەری کوڕە بچکۆلەکە، بە سەرکەوتوویی ئەنجامداو لە مەرگ ڕزگاری بوو.

پاش نەشتەرگەرییەکە، باوکی کوڕە بچکۆلەکە، ڕۆیشتە لای پزیشکەکەو پێی گوت:

زۆر زۆر سوپاستان دەکەم.. بەڕاستی بە سەلامەت دەرچوونی کوڕەکەم، بۆ خۆی موعجیزەیەك بوو.. دەمەوێت بزانم چۆن دەتوانم بە بڕی تێچوونی نەشتەرگەییەکە سوپاستان بکەمو لە بەرامبەر ئەو کارەتان، دەبێت چەندە پارە بدەم؟

دکتۆر ئارمسترۆنگ بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: بۆ خەرجی نەشتەرگەرییەکە، تەنها پێنج دۆلارەکەی سارای بچکۆلانە بدەن!!!

# تا سپێدە گریام

ڕاز هەڵەبجەیی

کاتێك کە بیستم وا بڕیارە محەممەد کوڕی ئاغای ڕەسوڵی بێت بۆ خوازبێنی سیمین، خەریکبوو لە تاو ناڕەحەتییەکی زۆر گیانم دەرچێت.

ئاغای ڕەسوڵی خۆشەویسترین هاوڕێی باوکم بوو، بە پێچەوانەی ئێمەوە سەروەتو سامانی هەمیشە لە زیاد بووندا بوو، باوکم دەیگوت: ئەو چەند ساڵ لەمەوپێش وازی لە فەرمانگەکەی هێناو بەو پارەیەی کە لە میراتی باوکییەوە بۆی جێ مابوو، دەستی بە کاری ئازاد کردووەو زۆر بەخێرایی دەوڵەمەند بووە، هەڵبەتە ئاغای ڕەسوڵی چەند جارێك پێشنیاری هاوبەشی بە باوکم داوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە باوکم کەسێکی بە ئارامو سادە بوو، حەزی لە کاری پڕ لە سەرقاڵی نە دەکرد، هەمیشە دەیگوت: من بەو مووچەیەی وەریدەگرم ڕازیم، چونکە شەوانە بە خەیاڵێکی ئاسودەوە خەوم لێ دەکەوێت، وەکو ئاغای ڕەسوڵی خەمی ئەوەم نییە خوا نەخواستە بەیانییەکەی وەزعی ماڵەکەم تێکبچێتو باڵەخانەکانم لە دەست بدەم، ئەم پیاوە لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا بە ئەندازەی تەمەنێك پیر بووەو خۆی هەستی پێ ناکات.

لە ڕاستیشدا هەروابوو، چونکە لەگەڵ ئەوەی باوکمو ئاغای ڕەسوڵی هاوتەمەن بوون، بەڵام سەری ئاغای ڕەسوڵی بە تەواوەتی سپی ببوو.

چەند ساڵ لەمەو پێش خانەوادەی ئاغای ڕەسوڵی لە گەڕەکی ئێمەوە بۆ گەڕەکێکی بەناوبانگ ڕۆیشتن، لە ماڵێکدا کە ڕووبەرەکەی هەزار مەتر بوو نیشتەجێبوون، ئێمە یەکەم کەس بووین کە بۆ پیرۆزبایی لە ماڵەکەیان سەردانمان کردن، بۆ نانی ئێوارەش هەر لەوێ بووین، ڕاستییەکەی من لە دیتنی خۆشیو ڕازاوەیی ماڵەکەیان حەپەسابووم، ماوەیەکی پێچوو تا چاوم بە دیتنی فەرشە ئاوریشمیو شتە سەیرو سەمەرەکانیان ڕاهات، بەڵام بۆ خانەوادەی ئێمە ئەو سەروەتەی ئەوان هیچ گرنگییەکی نەبوو، تەنانەت سیمین کە سێ ساڵ لە منیش بچووکتر بوو ئەمەی هەر بە خەیاڵدا نەدەهات، لە دیتنی هەڵسوکەوتی سیمین هیچ سەرم سوڕنەدەما، چونکە ئەو هەر لە منداڵییەوە وابوو، قەناعەتی بە هەموو ئەو شتانە دەکرد کە دەبوونە چارەنووسی، دایكو باوکیشم هەر بەو هۆیەوە زۆریان خۆشدەویست، هەمیشە چاودێرییان دەکرد، هەڵبەتە نەك ئەوەی کە لە نێوان ئێمەدا جیاوازییەکی تایبەت بکەن، بەڵام سادەییو ڕەفتاری ئەو هەموو کەسێکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، تا ئەو ڕادەیەش کە پورەکانمو خاڵەکانمو تەواوی بنەماڵەکەمان هۆگری ئەو ببوونو خۆشیان دەویستو زۆر میهرەبان بوون لەگەڵیدا، گرنگییەکەی لەوەدا بوو کە سیمین لە هەموو کەس زیاتر لە دەوروبەری مندا دەسوڕایەوەو هەوڵی دەدا من بۆلای خۆی ڕابکێشێت، لەگەڵ ئەوەشدا من هەرگیز خوشکێکی باش نەبووم بۆ ئەو، بەڵام ئەو هەرگیز ڕووی لێ وەرنەدەگێڕامو هەمیشە بە هەر بیانوویەك بووایە بە دەورمدا دەهاتو ڕووخسارمی نوقمی ماچ دەکرد، ڕاستییەکەی منیش لە ناخی دڵمەوە بە جۆرێك خۆشم دەویست، بەڵام کە دەمبینی هەموو کەسێك لە هەموو ڕوویەکەوە خۆشیاندەوێتو دەستخۆشی لێ دەکەن، دووبارە عەصابم تێك دەچوویەوەو لە دیتنی بێزار دەبووم، بە تایبەتی ئەو بە پێچەوانەی منەوە کە کچێکی زۆر جوان نەبووم، ئەو زۆر جوانو سەرنجڕاکێش بوو.

سیمین قژێکی خاوی ڕەشی درێژی هەبوو، پێستێکی سپیو چاوێکی شینی جوانی هەبوو، لە کاتێکدا من ڕووخسارێکی سادەو چاوێکی ڕەشم هەبوو، لەشولارێکی سادەم هەبوو، تەنها کەسێك کە زۆر دەیگوت تۆ زۆر جوانی، سیمین بوو، ئەو هەمیشە منی بە خوشکە جوانەکەم بانگ دەکردو زۆر بە میهرەبانییەوە ئەم قسەیەی دەکرد، هەرگیز وای بۆ نەدەچووم کە گاڵتەم پێ بکات، وەك ئەوەی کە بە بۆچوونی ئەو من جوانترین خوشکی سەر ڕووی زەویم، ئێستا کوڕەکەی ئاغای ڕەسوڵی لە جیاتی ئەوەی بێتە خوازبێنی جوانترین خوشکی سەر ڕووی زەوی، بۆ خوازبێنی خوشکە بچوکەکەم هاتبوو، دایکم بە شەوقو زەوقێکەوە هەواڵی خوازبێنییەکەی سیمینی بە باوکم دا، لە کاتێکدا کە من لە پشتی دەرگاکەوە وەستابوومو گوێم دەگرت، لە تاو ناڕەحەتی لەسەر زەوییەکە کەوتم، چەند مانگێك بوو محەممەد لە ئەمریکا بە بڕوانامەی پزیشکییەوە گەڕابووەوە، منیش هەر لەو ماوە کەمەدا کە لە میوانییەکاندا چاوم پێ کەوتبوو هەستێکم بۆ دروست ببوو، پێشتر هەرگیز وام لێ نەهاتبوو، لەوانەشە گەرموگوڕیو کرانەوەی ئەو لەگەڵ مندا هۆی ئەوە بووبێت کە من هۆگری ببمو لە خەیاڵەکانمدا ئارەزووی ئەوە بکەم کە ئەو ببێتە هاوسەری ژیانم.

ئێمە لە میوانییەکاندا بە زۆری لەسەر وانەکانمانو ئیشوکارمان قسەمان دەکرد، ئەو حەزی لە بەشەکەی من دەکرد، محەممەد دەیگوت: کە ئەو بەشەی من لە ئەمریکا گرنگی زۆری پێ دەدرێت، منیش هەستم بەوە دەکرد کە ئەو منی بۆ هاوسەری خۆی دەستنیشان کردووەو دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بمبات بۆ دەرەوە، بەڵام محەممەد لە جیاتی ئەوەی بۆ خوازبێنی من بێت بۆ خوازبێنی سیمین هاتبوو.

دایکم بە باوکمی وت: محەممەد ڕۆشتووەتە بەردەم زانکۆو لە نزیکەوە قسەی لەگەڵ سیمین کردووە، سیمینیش بەم خوازبێنییە ڕازی بووە.

وەڵامی باوکم بە تەواوەتی دیار بوو، بێگومان بەڵێ بوو، بەڵام دەبوایە زەماوەندی ئەوان دوا بکەوتایە تا ئەو کاتەی کە من زەماوەند دەکەم، سیمین ئەو شەوە هاتە ژوورەکەمو بە شەوقو زەوقێکەوە باسی ئەوەی کرد کە بە بینینی محەممەد لە بەردەم زانکۆدا شڵەژاوەو ویستویەتی بانگهێشتەکەی بۆ خوانی نیوەڕۆ ڕەت بکاتەوە، بەڵام ڕەفتاری محەممەد ئەوەندە جوانو بە شەخسییەت بووە بۆچوونەکەی دەگۆڕێت، سیمین وتی: بۆ پێشنیاری زەماوەند وەڵامی بەڵێی بە محەممەد نەداوە، بەڵام بە خۆشحاڵییەوە بە نیاز بوو بۆچوونی منیش دەربارەی ئەم زەماوەندە بزانێت، وتیشی بۆچوونی تۆ زۆر گرنگە بە لامەوە، منیش دەمزانی ئیدی کار لەکار ترازاوەو خۆشەویستی ئەو چووەتە دڵی سیمینەوە، ئەمەم لە چاوە شینە جوانەکانو کوڵمە سورەکانیدا دەبینی، ئەویش تووشی دەردێك ببوو کە من چەند مانگێك بوو تووش ببووم.

ئیرەیی من بەرامبەر بە سیمین ئەو شەوە گۆڕا بۆ ڕقو کینەیەکی تەواو، ئیتر خەفەتم بۆ قژە درێژو جوانەکانی ئەو نەدەخوارد، بەڵکو لە تاو ڕقی زۆرم بەرامبەر ئەو لەشم دەلەرزی، ئیتر تەنانەت حەزم نەدەکرد محەممەدیش ببینم، هەمیشە لە کاتی میوانییەکاندا خۆمم دوا دەخست، دڵنیابووم کە باوکم بە ئاغای ڕەسوڵی وتووە تا کچە گەورەکەم شوو نەکات، کچە بچووکەکەم نادەم بە شوو، ئەو مەسەلەیە زیاتر ئازاری دەدام، وام دەزانی ئەوان لەو ماڵەدا بۆ ڕۆیشتنی من هەمیشە نزا دەکەن، تەواوی شەوو ڕۆژم بە نزاکردن بۆ تێکچوونی ئەم مەسەلەیە بەڕێ دەکرد، بە نائومێدی ئارەزووم دەکرد کە بۆچوونی محەممەد بگۆڕێو من هەڵبژێرێت، بەڵام کاتێك باوکم بە ماڵی ئاغای ڕەسوڵی وت کە ئەڵقەی دەستگیرانی بکەنە پەنجەی سیمین، تەواوی هیواکانم بە ئاودا ڕۆیشت، ئیتر ئەوان مەحرەمی یەکتر بوون، زەماوەندەکەشیان بۆ

دوای زەماوەندی من دواخرا، لەو ڕۆژە بەدواوە سیمین بە ئازادی لەگەڵ محەممەد دەچووە دەرەوەو محەممەدیش هەرکاتێك حەزی بکردایە دەهات بۆ ماڵی ئێمە، زۆر لە دایکو باوکم بێزار بووم، بەوەی کە باوکم شەوێك پێش دەستگیرانیی سیمین هاتە ژوورەکەمو دوای ئەوەی کە زانی بە ڕووکەش من ڕازیم بە زەماوەندەکەیان ئەویش ڕازیبوونی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام دیسان هەر لێی بێزار بووم، شەوانە دوای ئەوەی کە لە زانکۆ دەگەڕامەوە یەکسەر دەچوومە ژوورەکەم، نەوەك ڕووبەڕووی محەممەدو سیمین ببمەوە، سیمین سەرەتا وەك جاران هەمیشە دەهاتە ژوورەکەمو هەموو شتەکانی خۆی بۆ باس دەکردم، بەڵام کە زانی من گوێی لێناگرمو ڕووی نادەمێ، ئیتر نەهات بۆ لام، بە هەرحاڵ شەوێکیان دایکم دەستی کرد بە قسەکردنو ناڕاستەوخۆ تێی گەیاندم کە ڕەفتارە ناشرینەکانمو ئیرەیی من هەموو ئەوانی بێزار کردووە، بە تەواوەتی دیار بوو کە دایکم زۆر نیگەرانی منەو حەز ناکات ئەوانی تر بە کچێکی حەسود سەیرم بکەن.

قسەکانی دایکم کەمێك لە ڕەفتارەکانی منیان گۆڕی، چونکە حەزم نەدەکرد کەس دڵسۆزیم لەگەڵ بنوێنێت، بەڵام هیچ لە ڕقو کینەکەم کەم نەبوویەوە، ڕۆژان تێپەڕیو منیش داواکارەکانم بە بێ هیچ هۆیەك ڕەت دەکردەوە، تەنها بە مەبەستی ئەوەی زەماوەندەکەی محەممەدو سیمین دوا بخەم، هەڵبەتە ئیتر محەممەدم خۆشنەدەویست، بەڵام بە هۆی کارەکەی ئەوو سیمینەوە پڕبووم لە ڕقو کینە، زۆر باش هەستم بەوە دەکرد کاتێك کە داواکارێکی تازەم دێت سیمین یەکسەر چاوەڕێی وەڵامی من دەکات، هەر بۆیە لە ڕقی ئەو یەکسەر ڕەتم دەکردەوە، هیچ بە لامەوە گرنگ نەبوو کە بەم کارانەم زەرەر لە داهاتووی خۆشم دەدەم، هەر لەم کاتەدا بوو کە عەلی هاتە خوازبێنیم، ئەو کوڕێکی جوانو تێگەیشتوو بوو، خانەوادەی ئەوان وەك خانەوادەی خۆمان وابوو، یەکێك لە دراوسێکان ئێمەی بە ئەوان ناساند، هەر لە سەرەتای ناسینمانەوە عەلی ڕەزامەندی خۆی بۆ زەماوەند لەگەڵ مندا نیشاندا، ڕاستییەکەی خۆشم لێی دەهات، بەڵام دیسان بە هۆی دوژمنایەتییەکەم لەگەڵ سیمیندا ئەویشم ڕەت کردەوە، بەڵام عەلی وازی نەدەهێناو تەنانەت چەند جارێکیش هاتە بەردەم زانکۆ تا قسەم لەگەڵدا بکاتو ڕازیم بکات کە زەماوەندی لەگەڵدا بکەم، وەڵامی من هێشتا هەر نەخێر بوو، بێ هیچ هۆیەکی سەرەکی، عەلی زۆر تکای لە باوکم کردبوو، تا ڕۆژێك باوکم بە تەلەفۆن داوای لێکردم کە بڕۆم بۆ لای بۆ سەر کارەکەی، چونکە دەیویست بە تایبەتی قسەم لەگەڵدا بکات، ئەسڵەن تاقەتی ڕۆیشتنم نەبوو، بەڵام جورئەتی ئەوەشم نەبوو کە قسە لە قسەی باوکمدا بکەم، خەریکبووم بۆ ڕۆیشتن خۆم ئامادە دەکرد، کە ئاگاداری گفتوگۆ تەلەفۆنییەکەی دایکم بووم، زانیم کە پورە گەورەکەم لەسەر خەتە، یەکەم جار ویستم لەماڵ بچمە دەرەوە، بەڵام کاتێك زانیم کە دایکم زۆر بە هێواشی قسە دەکاتو ناوێرێت دەنگی بەرز بکاتەوەو قسەکانی دەربارەی سیمینە شڵەژام، گوێم بۆ قسەکانی شلکرد، دایکم دەی گوت: خوا دەزانێت کە ئەگەر سیمین کچی خۆشم بووایە هەر ئەوەندە خۆشم دەویست، ڕاستە کە ئەو منداڵێکی دۆزراوەیە، بەڵام من بەرامبەری دایکایەتیم کردووەو ئێستاش ئەوە بە مافی خۆم دەزانم کە ئەو من بە دایکی خۆی بزانێت.

دایکم چەند دەقەیەك گوێی لە قسەکانی پورم گرتو بەردەوام بوو... ئاغای ڕەسوڵیو ژنەکەی لەم ڕاستییە ئاگادارنو ئەمەش بۆ ئێمە بەسە، ئیتر پێویست ناکات محەممەدو سیمین لەم مەسەلەیە ئاگاداربن، تا ئێستا هەموومان لەم بارەیەوە بێدەنگ بووین، بە ئومێدی خوا تا کۆتاییش لەسەر ئەم بێدەنگییە بەردەوام دەبین.

بە بیستنی ئەم قسانە هەستم کرد لەشم زۆر ساردەو بێ ئاگا بەخێرایی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، چەند سەعاتێك درێژەی کێشا تا توانیم لە قسەکانی دایکم تێ بگەمو لێکی بدەمەوەو بزانم کە هۆی سەرەکی ئەم هەموو جیاوازییەی منو سیمین چییە؟ کەواتە ئەو منداڵێکی دۆزراوەیەو دایك و باوکم ساڵانێکە ئەمەیان شاردووەتەوە، باوکم چەند جارێك تەلەفۆنی کرد بۆ ماڵەوە، بەڵام من سەرئێشەم کرد بە بیانوو و لە ماڵەوە مامەوە، ئەو شەوە تا بەیانی لە ژوورەکەمدا بیرم کردەوە، یەکەمجار ویستم لە ڕقا شتەکە بە سیمین بڵێم، بەڵام ترسام باوکمو دایکم ڕاستییەکە بزاننو سەرزەنشتم بکەن، بە هەرحاڵ بڕیارمدا بچم بۆ لای محەممەدو هەموو شتێك بە ئەو بڵێم.

محەممەد لە دیتنی من زۆر سەری سوڕما، هەروەك جاران پێشوازی لێکردم، یەکەمجار ماستاوی زۆرم بۆ کرد تا وابزانێت مەبەستێکی خراپم نییە! ئەو بێ چارەیە هەر چاوەڕێی ئەوەبوو کە ئەسڵی مەسەلەکەی پێ بڵێم، کاتێك کە بە شێوازێکی جوان پێم وت کە سیمین کچێکی دۆزراوەیە ئەو هیچ نەشڵەژا، بەڵکو یەکسەر وتی: نەك من، بەڵکو سیمین خۆشی لەم مەسەلەیە ئاگادارە. تەنها شتێك کە ئەو پێی سەیر بوو ئەوەبوو کە ئەو قسانەی لە دەمی منەوە بیست، لە خەجاڵەتیدا نوقمی ئارەق ببووم، محەممەد بە ئارامی بۆی ڕوون کردمەوە کە سیمین دەمێکە ئەم بابەتەی زانیوەو ڕاهاتووە لەگەڵیدا ئێستاش هیچ گلەییەکی نییە، حەزم دەکرد لە شوێنەکەم هەستم و ڕاکەم، قسەیەکی محەممەد وای لێکردم کە دانیشم، ئەو وتی: سیمین دەزانێت کە دایکو باوکی ئێوە منداڵیان نەدەبوو، بەڵام ئەمە بۆ ئەو فەرق ناکاتو ئەوان بە دایكو باوکی خۆی دەزانێت، باشترە ئێوەش هەر بەم شێوەیە لە مەسەلەکە بڕوانو نەبنە هۆی ئازار بۆیان. وەك کەسێکی گێژو وڕ لە شوێنەکەمدا هەستامو گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، قسەکەی محەممەد بەو مانایە بوو کە منیش منداڵی ئەو ماڵە نەبووم، بەڵکو منیش کچێکی دۆزراوەبووم!

نیوەشەو بوو ڕۆیشتم بەرەو ژورەکەی سیمینو ئەوم لە خەو هەستاند، سیمین بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم، بە ئارامی داوام لێکرد هەرچی دەربارەی ڕابردوومان دەزانیت بۆم باس بکە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك باسی ئەوەم بۆ نەکرد کە محەممەدم بینیوەو پێم وتووە، سیمین بۆی ڕوون کردمەوە کە ئێمە هەردووکمان منداڵی دۆزراوەینو بەخێوکراوین، ئەو تەواوی بەڵگەکانی بینیووە کە پەیوەستە بە منداڵیمانەوە، ئێمە هەردووکمان دوو منداڵی هەتیو بووین، کە دایكو باوکمان لە ڕوداوێکدا تیاچوون، لەبەرئەوەی کە ئەم دایكو باوکەی ئێستامان منداڵیان نەبووە ئیتر بەخێوکردنی ئێمە دەگرنە ئەستۆی خۆیان.

سیمین بە دەنگێکی نوساوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە پێی وتم: کە نەیویستووە لەم بارەیەوە دڵی دایكو باوکم بشکێنێت و بڕیاری داوە تەنها کاتێك کە زەماوەندی کردو لە ماڵی باوکم ڕۆیشت ئەو کاتە بە دوای دایكو باوکی ڕاستەقینەی خۆیدا بگەڕێت، تا بزانێت لە کەسوکارە ڕاستەقینەکەی کەسێکی بۆ ماوەتەوە، یان نا؟ خەریکبوو ڕۆژ دەبووەوە کە لە ژوورەکەی سیمین چوومە دەرەوە. هەردووکمان ئەوەندە لە باوەشی یەکتریدا فرمێسکمان ڕشتبوو ئیتر فرمێسکمان بۆ ڕشتن پێ نەمابوو، تەواوی ڕقو کینەکەم بەرامبەر بە سیمین وەکو بەفری زستان توایەوەو ڕۆیشت، زانینی ئەم ڕاستییە کە ژیانی منو ئەو یەکسان بووە، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەوخۆشەویستییەی کە بەرامبەر ئەو هەمبوو، بەڵام شاردبوومەوە دەری ببڕم، ئێستا چەند مانگێك بەسەر ئەو شەوەدا تێپەڕ بووەو هێشتا دایكو باوکمان نازانن کە ئێمە هەموو شتێك دەزانین.

منیش وەڵامی ڕازیبوونم دا بە عەلیو ئەویش بڕیاری دا، تا کۆتایی تەمەن هاوڕێو هاوسەری ژینم بێت، سیمینو محەممەدیش مانگێکە زەماوەندیان کردووەو چوونەتە سەر ماڵو حاڵی خۆیان، منو عەلیش خۆمان بۆ ئاهەنگی مارەبڕینەکە ئامادە دەکەین، ئێستا ئیتر گرنگ نییە کە من بە قەد سیمین جوان نیم، چونکە لە بری ئەوە ئێستا من جوانترینو میهرەبانترین خوشکە بچکۆلەی دنیام هەیە.

خوشکێك کە ساڵەهایە ئەم خەمەی لە دڵی خۆیدا هەڵگرتبوو، نەیدەویست بە وتنی ئەم ڕاستییە پایەکانی باوەڕ بە خۆبوونم بڕوخێنێت.

# پەرداخێك شەربەت بۆ ژیانێكی ئاسوودە

ئا: بەرزان ئەبوبەكر

هەمیشە لە گوزەرانو ژیانی هاوسەرێتی نارازی بوو، بەردەوام هەستی بە خەمو پەژارەو ماندووبوونو بێتاقەتی دەكرد، هەموو كات سكاڵای لە دەست هاوسەرەكەی دەكرد... پێی وابوو هاوسەرەكەی كەسێكی زۆر خراپەو مامەڵەو پێكەوە ژیانو بەردەوامی لەگەڵیدا زۆر ئاستەمە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند جارێك سەردانی پزیشكی دەروونی كردبوو، جارێكیان بۆ سكاڵا چووە لای پزیشكە تایبەتییەكەی خۆیو پێی وت: بەڕێز جەنابی دكتۆر، هەرگیز كەمتەرخەمیم لەگەڵ هاوسەرەكەمدا نەكردووە، هەر كات ڕێگەم بكەوێتە بازاڕ دیارییەكی تایبەتی بۆ دەكڕمو بە جوانترین شێوە پێشكەشی دەكەم، زۆر ڕۆژیش پێكەوە دەچینە دەرەوە بۆ خواردنی نیوەڕۆ، یاخود ئێواران، بە گشتی كەسێكی دڵنەرمو بەخشندەم لەگەڵ هاوسەرو منداڵەكانمدا، بەڵام هەموو ئەم ڕەفتارانەم نەبووەتە هۆی ئەوەی هەڵسوكەوتی خێزانەكەم لەگەڵمدا بگۆڕێت، ئیدی من بێزاربووەو تاقەتی ژیانی هاوسەرێتیم نەماوە، هەر چییەكی بۆ بكەم هێشتا ڕازی نییە، هەمیشە دەم بە گلەییو نارازییە لە ژیانو گوزەرانی، ئافرەتێكی ئینكارو سەرسەختە، من لە هەر شوێنێكی ماڵەكەدا دادەنیشم، ئەو ئەوشوێنە جێدەهێڵێت، بە درێژایی شەوو ڕۆژ دوو قسەم لەگەڵدا ناكات، كردەوەو ڕەفتارەكانی وای لێكردووم كە نەك ڕقم لە پرۆسەی هاوسەرگیرییە، بەڵكو ڕقم لە ناوەكەشییەتی، تەنانەت ڕقم لە هەموو ئافرەتانیشە، چونكە وادەزانم هەموو ئافرەتێك هاوشێوەی هاوسەرەكەی منە.

ئایا ئیدی پێویستە ژیانی منو ئەو بەردەوام بێتو پارێزگاری لە ژیانی هاوسەرێتیمان بكەم، لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتییەدا؟ پاشان ماوەیەك بێدەنگ بوو، دكتۆرەكە بە تەواوی گوێی لە قسەكانی گرت، پاشان مۆڵەتێك دروست بوو بۆ چوونە ژوورەوە بۆ نێو بابەتەكە، دكتۆرەكە دەڵێت: سەرەتا وتم: با كەمێك واز لەم بابەتە بهێنین، دوو قسەی خۆش بكەین، حەزت لە چ جۆرە شەربەتێكە، شەربەتی پرتەقاڵ، یان شەربەتی شیلك؟

كابرا وتی: نامەوێت هیچ شتێك بخۆمەوە، ئەوەی من نۆشیم لە تاڵایی ژین لەگەڵ خێزانەكەمدا بەسە، ئیدی پێویست ناكات شەربەت بنۆشم! كورد وتەنی: (هەنگوین لە زارمدا وەك ژەهری مارە).

وتم: من سورم لەسەر پرسیارەكەی خۆم، ئێستا پێم بڵێ، حەزت لە كام شەربەتەیانە؟

كابرا وتی: ئەگەر هەر پێداگری دەكەیت، با شەربەتی پرتەقاڵ بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت لە پەرداخێكی شووشەدا نۆشی بكەیت، یان پلاستیك، یان لە دەفرێكی كانزاییدا؟

كابرا وتی: لە پەرداخێكی شووشەدا.

وتم: ئایا دەتەوێت لە پەرداخێكی پاكوخاوێندا بێت، یاخود بە لاتەوە ئاساییە ئەگەر پەرداخەكە شوێن پەنجەی پێوە دیار بێت؟

كابرا وتی: نا، دەمەوێت لە پەرداخێكی پاكوخاوێندا بێت، نەك پیسو شوێن پەنجەی پێوە دیار بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت پەرداخەكە لەسەر سینییەكی پلاستیك بێت، یان سینییەكی كانزایی؟

كابرا وتی: با لەسەر سینییەكی كانزایی بێت.

وتم: لات ئاساییە ئەگەر سینییەكە كەمێك ژەنگی پێوە بێت؟

كابرا وتی: نەخێر، بەڵكو حەزدەكەم لەسەر سینییەكی پاكوخاوێن بێتو هیچ ژەنگێكی پێوە نەبێت.

وتم: ئایا دەتەوێت سینییەكە زیوی بێت، یان ئاڵتوونی، یا تێكەڵاو لە هەر دووكیان؟

كابرا وتی: دەمەوێت لەسەر سینییەكی ڕەنگ زیوی بێت.

وتم: ئایا دەتەوێت پەرداخە شەربەتەكە لە ژوورێكدا نۆش بكەیت كە ئامێری فێنككەرەوەی تێدایەو كەشێكی خۆشی هەیە، یان لە ژوورێكی گەرمدا؟

كابرا وتی: بێگومان، دەمەوێت لە ژوورێكدا نۆشی بكەم كە ئامێری فێنككەرەوەی تێدایەو كەشێكی خۆشی هەیە.

وتم: ئایا دڵخۆش دەبیت كە ژوورەكە پەنجەرەی فراوانی تێدا بێتو ڕووناكیو جوانی بەخشیبێت بە ژوورەكە؟

كابرا وتی: بەڵێ دەمەوێت ژوورێك بێت پەنجەرەی لەسەر بێتو دیمەنێكی

جوانی هەبێت.

وتم: ئایا دەتەوێت بە پێوە شەربەتەکە بخۆیتەوە، یان لەسەر کورسییەکی جوانو فراوان دابنیشیت؟

کابرا وتی: بێگومان لەسەر کورسییەکی فراوانو جوان.

وتم: ئەمە ئەوەیە کە تۆ دەتەوێت تا پەرداخێك شەربەت نۆش بکەیت، کابرا وتی: بەڵێ.

وتم: ئەگەر من لە بری پەرداخێك شەربەتی پرتەقاڵ، پەرداخێك شەربەتی شیلکت پێشکەش بکەم، بەو بیانووەی پرتەقاڵ لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا هەیەو لە هەموو شوێنێك دەست دەکەوێت، بەڵام شیلك تازەیەو تەنها لەم وەرزەدا هەیەو تاڕادەیەك شەربەتێکی دەگمەنە، هەروەها پەرداخەکە شوێن پەنجەی پێوەدیاربێت، بەو بیانووەی ئەو شوێن پەنجانە لە بەشی دەرەوەی پەرداخەکەیە نەك لە ناوەوە، لەسەر سینییەکی پلاستیکیش بێت بەو بیانووەی سینی تر پەیوەندی بەشەربەتەوە نییە، لە ژوورێکی گەرمدا، چونکە کەشی فێنكو سارد زیانی بۆ تەندروستی هەیە، کورسیشت بۆ دانانێم لەسەری دابنیشیت، بەو بیانووەی کاتت زۆر بە فیڕۆ نەدەم، چونکە کات ئاڵتوونە، یان کات وەکو شمشێر وایە ئەگەر نەیبڕیت، دەتبڕێت، هەروەها ژوورەکە پەنجەرەشی تێدا نەبێت، لەبەرئەوەی پەنجەرەی زۆر بیرو هۆشت پەرتەوازە دەکات، ئەگەر من هەموو ئەمانەم بەم ڕێگاو شێوازەی خۆم کە من پێی ڕازیم، پێشکەش کردی، نەك بەو ڕێگەیەی کە تۆ دەتەوێت، ئایا تۆ بەو میواندارییەی من دڵخۆش دەبیت؟

کابرا وتی: بێگومان نەخێر.

وتم: کەواتە من دەترسم لەوەی تۆ زۆر شت پێشکەشی خێزانەکەت کردبێت، بەڵام بەو ڕێگەیەی کە خۆت پێت خۆشەو لێی ڕازیت، نەك بەو ڕێگەیەی کە هاوسەرەکەت دەیەوێتو لێی ڕازییە!

هەروەها تۆ دەتەوێت ئەو وەکو تۆ وابێت، بێگومان ئەمەش بەڵاو نەهامەتییەکان زیاد دەکات، خۆ ئەگەر هاوسەرەکەشت هەمان ئەو ڕێگەیە بگرێتە بەر کە تۆ گرتووتەبەر، ئەوا هەر یەکەتان بە ئاراستەیەکی جیاوازدا دەڕۆن. ئەو کات لە یەکگەیشتنتان یەکجار دوور دەبێت.

کابرا کاتێك گوێبیستی ئەم ڕوونکردنەوانە بوو، سەری هەڵبڕیو وتی: زۆر ڕاستە گرفتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە لە نێوانی منو هاوسەرەکەمدا ڕوودەدات. هەر یەکەمان بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ یەکدی دەکەین کە خۆمان دەمانەوێت!!

# ژیان فێری کردم

- ژیان فێری کردم: پێویستە مرۆڤ خەون بە ئەستێرەکانەوە ببینێت، بەڵام دەبێت لە یادی نەکات کە پێیەکانی لە سەر زەوین.

- ژیان فێری کردم: سەرکردەی سەرکەوتوو، هەموو کات بەرپرسیارێتی شکست دەخاتە ئەستۆی خۆی، لەبەرئەوە دەڵێت: من شکستم هێنا، هەرگیز نالێت سەربازەکانم شکستیان هێنا!

- ژیان فێری کردم: دوو شت لەم ڕۆژگارەدا زۆر گرنگن، یەکەم: پێویستە لەسەر دەوڵەمەندان بیربکەنەوەو بزانن هەژارو دەردەدارەکان، چۆن ژیان دەگوزەرێننو چەند بە دەست گرفتو ناڕەحەتییەکانەوە دەناڵێنن!

دووەم پێویستە هەژارەکانیش فێربن کە چۆن دەوڵەمەندەکان کار دەکەنو بیر دەکەنەوە، لەوانەوە پەند وەربگرنو فێری ڕێگاکانی گەیشتن بە دەوڵەمەندی ببن.

- ژیان فێری کردم: کاتێك پێ دەکەنیت، جیهان بۆت پێ دەکەنێت، کاتێکیش دەگریت، بە تەنها خۆت دەگریت.

- ژیان فێری کردم: شکستخواردووەکان لە ژیاندا دووبەشن، بەشێکیان بیر دەکەنەوەو کارناکەن، بەشێکی تریان کاردەکەنو بیرناکەنەوە.

- ژیان فێری کردم: پێویست ناکات مرۆڤ هەوڵ بدات بۆئەوەی ببێتە کەسێکی سەرکەوتوو، بەڵکو پێویستە سەرەتا هەوڵ بدات ببێتە مرۆڤێکی ئاکار جوانو بە ڕەوشتو بە نرخ، ئەو کات سەرکەوتن خۆی بەرەو ڕووی دێت!

- ژیان فێری کردم: باشترین چەك کە مرۆڤی سەرکەوتوو خاوەنییەتی بریتییە لە کاتو ئارامگرتن.

- ژیان فێری کردم: جیاوازی مرۆڤی سەرکەوتوو، سەرنەکەوتوو، بریتی نییە لە هێزو تواناو شارەزایی، بەڵکو بریتییە لە ویستو ئیرادەی بەهێز.

- ژیان فێری کردم: هەموو ئەو دۆزینەوەو داهێنانانەی کە ئەمڕۆ دەیانبینین، پێش داهێنانو دۆزینەوەیان خەڵکانێك دەیانگوت کاری لەو جۆرە یەکجار ئاستەمەو هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت بە دەستی بهێنێت.

- ژیان فێری کردم: کە زەردەخەنەیەك هیچی تێناچێت، بەڵام واتاو مانای زۆر دەبەخشێت.

ئەوا دووبارە قوربان، دڵم قوربانی قوربانە
فەوارەی ئێشکی چاوانم، وەکو بارانی نیسانە
نەبوو دکتۆرێ زانا، تێ بگا دەردم چ دەردێکە
تەواو بێزارم ئەمڕۆکە، لە دەس دەرمانی کوێرانە

جەژنی قوربان لە یادەوەری هەمووماندا جێگای تایبەتی هەیەو بۆنەیەکی بەرزو لە دڵا شیرینە، وشـەی قوربان مانای بەرزی قوربانیدانو تێکۆشـانو فیداکاریمان فێر دەکات.

لـە قوتابخانـەی جەژنـی قوربانەوە وانەی تەباییو یەکڕیزیو سوپاسـگوزاری خوداوەندو سـۆزو بەزەیـیو یارمەتیدانی یەکتـرو ئاوڕدانـەوەی میهرەبانانـە بـۆ هەژارانو نەداران فێر دەبین.

جەژنی قوربانی ئەو سـاڵ ئەم شیعرە جوانەی (قانع)ی شـاعیری هێنامەوە یاد، کە دەڵێت:

ئەوا دووبـارە قوربان، دڵـم قوربانی قوربانە

فەوارەی ئێشـکی چاوانم، وەکو بارانی نیسانە

نەبوو دکتۆرێ زانـا، تێ بگا دەردم چ دەردێکە

تـەواو بێـزارم ئەمڕۆکـە، لـە دەس دەرمانی کوێرانە

(قانـع) ئـەو شـاعیرە دڵسـۆزە کوردپـەروەرەی کـە کوردایەتی سـرودی ژیانو دروودی ڕۆحی بوو!

گەورەترین ئاواتی پێشکەوتنو بەرزیو بڵنـدی وڵاتو نەتەوەکەی بوو، لە سـاتە خۆشـەکانی ژیانو لە ڕۆژانی جەژنیشـدا هـەر خەیاڵی لای میللەتەکـەی بووەو بە دوای دکتۆرێکی زانادا وێڵ بووە، کە دەردی نەتەوەکـەی بیمـار بکاتو بێـزاری خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر دەرمانو چارەسەری کوێرانە!!

ئەو شـاعیرە بەرزەی کە هەر کەسێك شیعرەکانی بخوێنێتەوە، دەزانێـت نـەك هـەر فرمێسـکی ڕشـتووە، بەڵکو بە خوێنی دڵی ڕیزبەندی شیعرەکانی هۆنیوەتەوە.

ئەو شاعیرە دووربینو شارەزاو میللەت دۆسـتو وڵاتپەروەرە هەمیشە بانگخوازی برایەتیو یەکڕیزیو خۆشەویسـتی بووە، هاندەرێکی وریای پێشـکەوتنو تەرەققیو گەیشتن بە کاروانی زانسـتو تەکنەلۆژیا بووە.

با ئێمـەش لە جەژنـی قورباندا لە یادی ئەو شاعیرە بەرزەدا ڕۆحی ئاسوودە بکەیـنو ئەو دکتـۆرە شـارەزایە بین کە لێزانانـە دەرمانـی دەردی میللەتەکەمان بکەیـنو چارەسـەری کێشـەکان بکەین، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش ئامـادەی هەموو قوربانییەك بین.

قوربانیش لە هەموو لایەك پیرۆز.